# ئەلبێر کامۆ

# نـامۆ

**( رۆمـان )**

## تـرجمه

**جلال ئاَل احمد- علی اصغر خبرەزادە**

**مۆسسه انتشارات نگا**

**تهران- ١٣٧٩**

**وەرگێرانی له فارسییەوە**

**حەمە کەریم عـارف**

## چـاپی سێیەم

**٢٠٠٧**

## بژارو دەسکـاریکراو

# بەشی یەکەم

((١))

دایکم ئەمرۆ مرد. لەوەشە دوێنێ مردبێ، نازانم. بروسکەیەکم بەم ناوەڕۆکە لە خانەی پیرانەوە پێ گەییوە: (( دایە، مرد. ناشتنەکەی سبەینێ یە. هاوخەمتانین )) هیچم لە تەلەگرافەکە دەست نەکەوت. ڕەنگە ئەم قەوماوە دوێنێ ڕویدابێ.

کەترەخانە لە مارنگو-ی هەشتا کیلۆمەتری جەزایر دایە. سەعات دوو سواری پاس دەبم و پاش نیوەڕۆ دەگەمە ئەوێندەر. بەمجۆرە، دەتوانم شەوێ لە کەناری ڕێگاکە بێداربم و سبەی عەسر بگەڕێمەوە. داوای دوو ڕۆژان مۆڵەتم لە بەڕێوەبەرەکەم کرد کە لەبەر ئەم هەنجەتە نەیدەتوانی ڕەفزی بکات. لەگەڵ ئەمەشا لە دڵا ڕازی نەبوو. تەنانەت پێم گوت: (( تەخسیری من نییە )) هیچ وەڵامێکی نەدامەوە. پاشان بیرم کردەوە کە پێویست نەبوو ئەمەی پێ بڵێم کە لە ڕاستیدا من نەدەبوو تەوازۆی لێ بخوازم. دەبوایە ئەو دڵم بداتەوە. بەڵام گومانی تیا نییە ئەم کارەی بۆ دوو سبەی داناوە کە من بە جلی تازیە بارییەوە دەبینێ. چونکە ئێستا وەکو ئەمەیە کە دایکم هێشتا نەمردبێ.

بەڵام دوای ناشتنەکە، کارەکە دەبڕێتەوە و هەموو شتێك لایەنی فەرمی لە خۆ دەگرێت.

سەعات دوو سواری پاس بووم. دنیا زۆر گەرم بوو، وەکو هەمیشە لە لە ریستوران دا، لە لای ( سلست ) نیوەڕۆژەم خوارد. هەمووان هاوخەمی خۆیان بۆ دەردەبریم و سلست پێی گوتم:(( کەس جێگەی دایك ناگرێتەوە. )) گاڤێ وەڕێ کەوتم، هەمووان تا بەردەرکە بە ڕێیان کردم. تۆزێك سەرگەردان بووم. چونکە دەبوو بچم بۆ ماڵی ئیمانوئیل و کەراوێتە ڕەش و باسك بەندەکەی بە ئەمانەت لێ وەربگرم. چەند مانگێك لەوە پێش مامی مردبوو.

بۆ ئەوەی فریای پاس بکەوم، غارم دا، هەڵبەتە بە هۆی ئەم پەلە پەل و غاردان و دەنگە دەنگی ئوتومبیلان و بۆنی بەنزین و تیشکی هەتاو و عەکس بوونەوەی لەسەر جادەکە بوو کە خەو گرتمی، تەقریبەن بە درێژایی ڕێگاکە خەوتم. کاتێ کە ڕابووم، کەوتبووم بەسەر پیاوێکی سوپایی دا.سوپاییەکە بە ڕووما پێکەنی و پرسی کە ئایا لە ڕێیەکی دوورەوە دێم. وەڵامم دایەوە(( بەڵێ )) بۆ ئەوەی هیچ شتێکی دی نەڵێم.

کەترەخانەکە لە دوو کیلۆمەتری گوندەکەدایە. ئەم ڕێگەیەم بە پێیان بڕی. ویستم یەکسەر دایکم بدینم. بەڵام دەرگاوانەکە گووتی دەبێ یەکە مجار موراجەعەی بەڕێوەبەر بکەم. چونکە بەڕێوەبەر مژولی کار بوو، کەمێك سەبرم کرد.کابرای دەرگاوان بە درێژایی ئەم ماوەیە هەر قسانی کردو ئاقیبەت بەڕێوەبەرم بینی. و لە نووسینگەکەی خۆیدا پێشوازی کردم. پیرەمێردێکی ئەندام وردیلە بوو کە نیشانی (( لژیون دونور )) ی بە بەرۆکەوە بوو. بە چاوانی گەش نیگای کردم. پاشان دەستی گوشیم و ئەوەندە لە نێو دەستی خۆیدا رایگرت کە نەمدەزانی چۆن دەری بێنم. تەمەشای فایلێکی کردو گووتی: (( خات مەرسۆ بەر لە سێ ساڵ هاتووەتە ئێرەو تۆ تاقە پشت و پەنای ئەو بوویت. )) پێم وابوو سەرزەنشتم دەکات. بۆیە ویستم هەندێ ڕوونکردنەوە بدەم. لێ قسەکەی بڕیم: (( کوڕی ئازیزم پێویست بە پاکانە ناکات. من

دۆسییەکەی دایکتم خوێندووەتەوە. تۆ نەتدەتوانی پێداویستییەکانی دابین بکەیت. ئەو پێویستی بە پەرستارێك بوو. دەرامەتی تۆ کەم بوو. لە مانەش بترازێ ئەو لێرە بەختەوەرتر بوو. )) گوتم: ((بەڵێ جەنابی بەڕێوەبەر. )) لە سەری ڕۆیی: ((دەزانی ئەو لێرەدا کۆمەڵێك دۆستی هەبوون، خەڵکانێك لە سونحی خۆیدا و دەیتوانی خۆشییەکانی زەمانی رابردوویان لە گەڵ دا باس بکات. تۆ گە نجیت و ژیان لە گەڵ تۆدا بێ تاقەتی دەکرد. ))

ئەمە دروست بوو، کە دایکم لە ماڵەوە بوو، هەمیشە کرو کپ نیگای دەکردم. ڕۆژانی هەوەڵ کە تازە هاتبووە پیر خانەکە بەزۆری دەگریا. چونکە هێشتا بە شوێنە تازەکە رانەهاتبوو. دوای یەك دوو هەیڤان گەر بیانویستایە لە کەترەخانەکە بیهێننە دەرێ دەگریا. چونکە بەوێندەر راهاتبوو. هەر بۆیە لە دوا ساڵی ئاکنجی بوونیا بە دەگمەن دەچوومە دیدەنی. لەمەش بترازێ یەك شەممەکەی لێ تێکدەدام. ئەمە جگە لەوەی دەبوایە زەحمەتی سەفەر بە پاس و بڕینی بلیت و دوو سەعاتە ڕێگا بکێشم.

بەڕێوەبەرەکە هەمدیس قسەی لە گەڵ کردم. لێ من گوێم لێنەدەگرت. ئەوجا گوتی: ((پێم وایە دەخوازی دایکت بدینی. )) من بێ وەی وەلامێك بدەمەوە، هەستام. و ئەو تا بەر دەرگاکە پێشوازی کردم. لە سەر قالدرمەکە گوتی:((لە ژوورە بچکۆلەکەی مردووان دا دامانناوە. بۆ ئەوەی ئەوانی دی نارەحەت نەبن. لێرەدا هەر گاڤێ کەسێك دەمرێ ئەوانی دی تا دوو سێ رۆژ تورەن و ئەمەش بەرێوەبردنی کاروباری پیرخانەکە زەحمەت دەکات. ))

لە حەسارێکەوە تێ پەڕین کە ژمارەیەکی زۆری پیرەمێرد، لەوێ دا، دەستە دەستە پێکەوە قسانیان دەکرد. کاتێ کە ئێمە بە بەر دەمیانا رەت دەبووین، بێدەنگ دەبوون. لە دوای ئێمەوە گفتوگۆ دەستی پێدەکردەوە. لە تۆ وایە چەنەچەنی توتیانە. لە بەر دەرکەی بینایەکی چکۆلەدا، بەڕێوەبەرەکە لێم جیا بووەوە:((جەنابی مەرسۆ من بە تەنیا بەجێت دێڵم. لە نووسینگەکەی خۆما دە خزمەتو دام. بە پێی داب سەعات دەی بەیانی بۆ ناشتنەکەی دانراوە. چونکە پێمان وابوو بەم شێوەیە تۆ دەتوانیت شەوێ بە دیار رەحمەتی یەوە دابنیشیت. گوتەیەکی دیکەش: دایکت زۆربەی کات بە دۆستەکانی گوتووە کە دەخوازێ بە رێورەسمی ئاینی بە خاك بسپێردرێت. من لەسەرمە پێداویستییەکانی ئەم کارە فەراهەم بکەم، بەلام ویستم تۆش ئاگادار بی. )) سوپاسم کرد. دایکم ئەگەرچی هیچ بێدینییەکی دەرنەدەبڕی، لێ کە لە ژیانا بوو هەرگیز بیری لە دین نەدەکردەوە.

ژوورە چکۆلەکە زۆر رووناك بوو، میچەکەی شووشە بەند بوو. کۆمەڵێك کورسی و سێپای راست و چە پی تێدا بوو. لە ناوەراستاو لەسەر جووتێك لەوسێپیانە تابووتێك بە سەرپۆشێکی تایبەتییەوە دانرابوو. مێخی بریقەداری تابووتەکە دەبینران کە هێشتا دانەکوترابوون ولەسەر تەختەی تابووتەکەوە کە بەتوێکلی گوێز رەنگیان کردبوون زەق دەچوونەوە.

ژنە عەرەبیکی پەرستار کە کراسێکی سپی و لەچکێکی تۆخی لەسەر کردبوو لە نزیکی تابووتەکەوە وەستابوو. دەرگاوانەکە لەم ساتەدا لە دوای منەوە وەژوورکەوت. دیاربوو کە غاری دابوو. بەدەمە لالکێوە گووتی: ((سەری تابووتەکەیان داخستووە، بۆ ئەوەی تۆ جەنازەکە بدینی دەبێ بزمارەکان دەرکێشم. )) لە تابووتەکە نزیك بوو بووەوە،کە رامگرت پێی گووتم: ((ناتەوێ؟)) گووتم: ((نە)). راچڵەکی. نارەحەت بووم. چونکە هەستم کرد کە نەدەبوو ئەو قسەیە بکەم. دوای تۆزێك نیگایەکی کردم وبێ هیچ

سەرزەنشتێك،وەك ئەوەی بزانێ بۆ، پرسی: ((لەبەرچی؟)) گوتم: ((نازانم)) هەنگێ بەدەم بادانی سمێڵە چەرمووەکەیەوە گوتی: ((تێ دەگەم))جووتێ چاوی شینی گەشی هەبوو، بە خۆیشی کەمێك سوورە بوو. کورسییەکی دایە من وبە خۆیشی کەمێك لە دوای منەوە دانیشت. پەرستارەکە هەستاو بەرەو دەرگاکە رۆیی و لەم ساتەدا دەرگاوانەکە پێی گووتم: ((ئەم ژنە قورحەیەتی.))چونکە هیچ حاڵی نەبووم ئاوڕێکی لای پەرستارەکەم دایەوەو دیتم لە ژێر چاوەکانییەوە نەوارێکی بردووەو بە دەوری سەریا پێچاوە. نەوارەکە لە دەوروبەری کە پوویا ساف بوو. تەنیا سپێتی نەوارەکە بە دەموچاویەوە دیار بوو.

دوای رۆیشتنی ئەو دەرگاوانەکە گوتی: (( نهۆ بە تەنیا جێت دەهێڵم.))

نازانم چمکرد کە رۆیی و لە دوای منەوە وەستا. بوونی ئەو لە پشتمەوە ئازاری دەدام، تیشکی دڵئەنگێزی پاش نیوەڕۆ هەوو ژوورەکەی گرتبووەوە. گیزە گیزی جوتێك زەرگەتەی زەرد لە پشت شوشەکانەوە دەگەییە گوێ، هەستم کرد خەو گرتوومی. بێ ئەوەی ئاوڕ لە دەرگاوانەکە بدەمەوە گوتم :((چەندە کە لەم خانەی پیرانەدای؟)) وەکو ئەوەی دەمێك بێ چاوەنۆری ئەم پرسیارە بووبێ، یەکسەر وەڵامی دایەوە:(( پێنج ساڵە)) پاش ئەوە چەنەچەنێکی زۆری کرد. ئەگەر بەر لەمانە پێیان گوتبا کە بە کاری دەرگاوانی لە ((مارنگو)) رۆژگاری خۆی دەباتە سەر، زۆری پێ سەیر دەبوو. تەمەنی شەست و چوار ساڵ و خەڵکی پاریس بوو. لەم کاتەدا قسەکەم پێ بڕی:((ئا، واتە خەڵکی ئێرە نیت؟ ئەوجا بیرم کەوتەوە بەر لەوەی کە من بۆ ژوورەکەی بەڕێوەبەر ببات، باسی دایکی لەگەڵ کردبووم. گوتبووی کە دەبێ زۆر زوو بەخاك بسپێردرێ چونکە لە بیاباندا، بە تایبەتی لەم ناوچەیە، دنیا زۆر گەرمە. ئەو دەمە پێی گوتبووم کە لە پاریسدا دەژیا. کە هەرگیز یادەوەری ئەوێندەری لە بیر ناچێت. گوتبووی کە لە پاریس دا دەشێت مردوو تا سێ رۆژ و هەندێ جار تا چوار رۆژ بهێڵرێتەوە. بەڵام لێرەدا کاتی ئەم شتانە نییە. هەر نابێ بیریش لەوە بکرێتەوە کە لێرەدا دەبێ بە دووی جەنازەکێشەکەدا غار بدەی. لەم کاتەدا ژنەکەی پێی گوتبوو:((وس بە، ئەمانە شتێك نین کە بشێت بەم لاوە بگوترێن)) و کابرای پیرەمێرد سوور بووەوە و عوزرخوایی کرد. من گوتبووم :(( قەیدی نییە. قەیدی نییە؟)) ئەوەی کە پیرەمێردەکە گوتبووی پێم دروست و باش بوو .

لەژوورە کۆلەکەی مردوواندا کە وەك بنیادەمێکی هەژارو بێنەوا هاتبووە ئێرەو چونکە لە خۆی رابینیوە، ئەم کاری دەرگاوانییەی قبوڵ کردووە .گوتم لە هەمان کاتا ئەویش یەکێکە لە خەڵکانی ناو ئەم خانەی پیرانە.گووتی نە. لە هەوەڵێشەوە پێم سەیر بوو کو بۆچی کاتێ دێتە سەر باسی خەڵکانی ناو خانەی پیران زیاتر وشەی(( ئەوان)) وزۆر کەم وشەی(( پیرەکان)) بەکار دێنێ.لە کاتێکا کە زۆربەیان زۆر لەو گەورەتر نەبوون، لێ ئاساییە کە ئەو یەکێ نەبوو لەوان. ئەو دەرگاوان بوو. و هەندێ جار بە سەرپەرشتیاری وان دەژمێردرا.

لەم کاتەدا پەرستارەکە وەژوورکەوت. شەو کوتوپڕ داهاتبوو. هەر زوو شەو چۆکی بەسەر شووشەکاندا دادا. دەرگاوانەکە سویچی کارەباکەی کردەوەو تیشکی کوت و پڕ بەشەوارەی خستم. بۆ شێو خواڵکی کردم بەڵام من برسیم نەبوو.خواڵکی کردم کە فینجانێك قاوەو شیرم بۆ بێنێ. چونکە زۆرم حەز لێ بوو قبوڵم کرد، ودوای تۆزێك بە سینییەکەوە گەڕایەوە. شیرو قاوەکەم خواردەوە. ئەوجا حەزم چووە سەر جگەرەیەك. بەڵام دوو دڵ بووم. :چونکە نەمدەزانی کە ئاخۆ دەشێت ئەم کارە لەبەردەم دایکما بکەم.بیرم کردەوە کە ئەم کارە هیچی تیا بەسەر نییە. جگەرەیەکم دایە دەرگاوانەکەو کەوتینە جگەرەکێشان.

دوای تۆزێك دەرگاوانەکە گوتی: ((دەزانی دۆستەکانی دایکیشت دێن تا ئەمشەو لێرەبن .ئەمە عـادەتی ئێرەیە. من دەبێ بچم کورسی و قاوەی رەش ئامادەبکەم.))لێم پرسی ئـاخۆ دەشـێت یـەکێك لـە گڵۆپـەکان بکوژێنرێتەوە؟ شۆقی روناکییەکە لەسەر دیوارە سپییەکە ماندووی دەکردم، پێی گوتم کاری واهـی نابێـت. تەلەکان بە جۆرێ راکێشراون یا هەموو گڵۆپەکان پێکەوە هەڵدەبن یـا هیچیـان هـەڵنابن.ئیـدی مـن گـوێم نـەدایێ. ئـەو چـووە دەرێ و گەڕایـەوە. کورسـییەکانی دانـا. فینجانـەکانی لەسـەر کورسییەك، لـە دەوری جەزوەیەك دانا. ئەوجا بەرانبەر بەمن، لە دیوەکەی تری دایکمەوە دانیشت. پەرستارەکە هەر بـەو دەقـەوە لە بنی ژوورەکەدا، پشت لە ئێمە وەستا بوو. من نەمدەبینی کە چی دەکرد. بەڵام بە گوێرەی جوڵەی دەستیا دەزانرا کە شتێك دەچنێ. هەوا خۆش بوو. قاوەکە گەرمی کردبوومەوە. لە دەرگاکـەوە کـە کرابـووەوە بـۆنی شەو و گوڵان دەهاتە ژوورێ. پێم وایە کەمێك خەوتم. دەنگی خشەخشێك بێـداری کردمـەوە. چـونکە چـاوم نوقابوون، روناکییەکە لە جاران ناخۆشتر بوو. تاقە سێبەرێکیش لە بەردەمما نـەدەبینرا. هـەموو شـتێك، هەر گۆشەیەك، هەموو پێچەکان بە لاسارییەکی تاقەتبەرەوە لەبەر چاوم بەرجەسـتە دەبـوو.دۆسـتەکانی دایکم لەم کاتەدا وەژوورکەوتن. دە دوانزە کەسێك بوون. وبە بێدەنگی وەناو ئەم روناکییـە بەشـەوارەخەرە کەوتن. بێ ئەوەی تاقە دەنگێك لە کورسییەکانەوە بەرزبێتەوە لەسەریان دانیشتن. بەجۆرێ تـێم دەروانـین وەکو ئەوەی تا نهۆ هیچ کەسێکم نەدیبێ. بچوکترین پارژی سیماو جلەکانیان لە نیگـام دەربـاز نـەدەبوو. لـە گەڵ ئەمەشا هـیچ دەنگـێکم لێ نەدەبیسـتن و زۆر بەزەحمـەت بـاوەڕم بـە بوونیـان دەکـرد. زۆربـەی ژنـەکان بەرکۆشەیان بەستبوو. بە پەتێك ناوقەدیان بەستبوو وئەمە سکی داکەوتوویانی زیاتر بەرجەستە دەکـرد. تا ئەوکاتە هەرگیز نەمزانی بوو کە پیرەژنان چۆن ورگیـان دەبـێ. پیاوکـان هـەموو لاواز و عاسـا بەدەست بوون. ئەوەی مایەی سەرنجم بـوو ئەمـە بـوو کـە چـاوم نـەدەبینین، تـەنیا روناکییـەکی لێـڵ لـە ناوەنـدی چاڵێکی پڕ لە چرچ و لۆچدا دەبینرا. کە دانیشتن زۆربەیان تەمەشای منیان کردو بە ئەستەم سەرێکیان بـۆ لەقاندم وچونکە لێویان چوو بووە ناو زاری بێ ددانیانەوە من حاڵی نەبووم کـە ئایـا سلاوم لێدەکـەن یـان تەنیا جوڵەیەك سەری بزواندوون. لێ پێم وایە سلاویان کرد. لەم کاتەدا زانیم هەموویان لە بەرانبەر منـا وبە دەوراودەوری دەرگاوانەکەدا دانیشتوون. وسەردەجوڵێنن. لە پڕێکا ئەم بیرۆکە گاڵتە جاڕییەم لا دروست بوو کە هاتوون من دادگایی بکەن.

دوای کەمێك یەکێك لە ژنەکان کەوتە گریان، لە ریزی دووەم، لە پشت یـەکێك لـە هاوڕێکانیـا پـەنهان بووبوو. من بەزەحمەت دەمبینی، بەدەم کورتە هەنسکەوە بـەردەوام دەگریـاو وامـەزانی کـە ئیـدی هـەرگیز ناوەسـتێتەوە. ئـەوانی دی وەك بڵێـی گریانەکـەی ئـەو نەژنـەون، هـەموو خـەمین ومـات وبێـدەنگ بـوون. دەیانڕوانییە تابووتەکە یا دارعاساکانی دەستیان یا هەرشتێکی دیکە، بەڵام جگـە لەمـە نەیاندەروانییـە هیچی دی. ئەو ژنە هەردەگریا، زۆر حەیرمابووم. چونکە من نەمدەناسی. حـەزم نـەدەکرد گـوێم لـە دەنگـی ببێ. لێ زاتم نەبوو ئەوەی پێ بڵێم. دەرگاوانەکە بەلای ئەودا دانەوییەوە، قسەیەکی کرد، لێ ئـەو سـەری دانەواند، لە بن لێوانەوە شتێکی گووت و بە هەمان شێوە درێژەی بە گریانەکەی دا. ئەوسا دەرگاوانەکە بـۆ لای من هات. لە نزیکمەوەدانیشت. پاش ساتێکی دوورو درێژ، بێ ئەوەی نیگام بکات پێـی وتم: ((ئـە ژنـە زۆر لە دایکتەوە نزیك بوو. دەڵێت ئەو لێرەدا تاقە دۆستی بووەو نهۆ ئیدی چ کەسێکی نییە.))

ماوەیەکی زۆر بە مجۆرە دانیشتین. نالەو هەنسکەکانی ئەو ژنە کەمتر بوو بووەوە. ماوەیەك پرخاندی وئاقیبەت بێدەنگ بوو. من هێشتا خەوم نەدەهات. لێ شەکەت بووم و گورچیلەکانم دەیەشان. ئێستا بێدەنگی هەموو ئەم بنیادەمانە ئازاریان دەدام. جار جارێ تاقە دەنگێکی تایبەتی کە بۆم دیاری نەدەکرا دەگەییە گوێم. دوای ماوەیەك ئاخری زانیم کە چەند دانەیەك لە پیرەمێردەکان لە دیوی ناوەوە گوپی خۆیان دەمژن وئەم ملچە ملچە سەیرە دەردێنن. بە جۆرێ غەرقی بیرو هزری خۆ بووبوون کە ئاگایان لەم کارەیان نەبوو وتەنانەت ئەم بیرەم بە مێشکا هات کە ئەم مردووەی کە لەناو ئەوانا کەوتووە چ گرنگییەکی بۆ ئەوان نییە. لێ ئێستا دەزانم کە ئەمە بیرێکی هەڵەبووە.

هەموومان ئەو قاوەیەمان خواردەوە کە دەرگاوانەکە دروستی کردبوو. ئیدی نازانم چی روویدا. شەو بوری بوو. ئەوەندەم لەبیرە کە جارێك چاوم هەڵێنا و دیتم پیرە مێردەکان پاڵیان بە یەکەوە داوەو خەوتوون. جگە لە یەکێکیان کە چەناگەی نابووە سەر ئەو دەستەی کە گۆچانەکەی پێ گرتبوو. وئەبڵەقانە دەیڕوانییە من، وەك ئەوەی لە مێژ بێ چاوەڕوانی بێداربوونەوەی من بێ. دووبارە خەو بردمییەوە. لە ئازاری بێ ئەندازەی گورچیلەکانم خەبەرم بووەوە. خۆر لەسەر میچە شوشەبەندەکەوە دەخزییە ژوورەوە. دوای کەمێك یەکێك لە پیرە مێردەکان رابوو وزۆر کۆکی. تفەکەی دەکردە دەستەسڕێکی خانەخانەی گەورەوە، هەر کۆکەیەکی وەکو گیان کێشانێك بوو. ئەوانی دیکەشی خەبەر کردەوەو دەرگاوانەکە بەگوێیدادان کە دەبێ بڕۆن. هەستان. ئەم شەو نخوونییە نارەحەتە دەموچاوی کەوە کردبوون. لەوە سەرم سوڕمابوو کە کاتێ وەدەرکەوتن، هەموو تەوقەیان لە گەڵکردم. لە تۆ وایە ئەو شەوە کە تاقە قسەیەکمان تیا لەگەڵ یەکدی نەکردبوو، دۆستایەتیمانی دوو چەنانە کردبوو.

ماندووبووم. دەرگاوانەکە بۆ ژورەکەی خۆی بردم کە توانیم لەوێندەر خۆم رێك بخەم. هەمدیس شیرو قاوەیەکمان خواردەوە کە زۆر بە لەزەت بوو. گاڤێ وەدەرکەوتم خۆر تەواو بەرز بوو بووەوە. ئاسمان بەسەر ئەو گردۆلکانەوە کە مارنگۆی لە دەریا جیا دەکردەوە، غەرقی سووری بوو وئەو شنە بایەی کە بەسەر گردۆلکەکاندا تێدەپەڕی بۆن وبەرامەی خوێی لەگەڵ خۆدا دێنا. رۆژێکی زۆر جوان بەرێوە بوو. لە مێژ بوو کە نەچوو بوومە گوندی، پێم وابوو ئەگەر دایکم لە ئارادا نەبووایە لەزەت وخۆشییەکی فرەم لە گەشت و گەرانی ئەمڕۆکە دەبینی.

لە حەسارەکەدا، لە ژێر دار چنارێکدا، بەدەم چاوەڕوانییەوە وەستابووم. بۆنی زەوی تەڕ و شێدارم هەڵدەمژی و خەوم نەدەهات. هاوکارانی دایەرەی خۆمم بیر کەوتەوە کە هەموویان لەم کاتەدا رادەبوون تا بچن بۆ سەر کار. بۆ من ئەم سانە هەمیشە، دژوارترین سات بوو. تۆزێکی دیکەش بیرم لەم شتانە کردەوە. بەڵام لە ناکاو دەنگی زەنگێك لە ناو بیناکەوە داوی بیرکردنەوەی پچڕیم. لە پشت پە نجەرەکەوە هەندێ جم وجوڵ بینرا. ئەوجا هەموو شوێنەکان کپ و ئارام بوون. هەتاو تۆزێ بەرزتر بوو بووەوە: قاچەکانم خەریك بوو گەرم دەبوونەوە. دەرگاوانەکە کە بە حەسارەکەدا رەت دەبوو پێی گووتم کە بەرێوەبەر دەیەوێم. چووم بۆ نووسینگەکەی. چەند کاغەزێکی پێ ئیمزا کردم. سەیرم کرد ڕەشی پۆشیبوو و پانتۆڵێکی خەت خەتی لەبەر بوو. تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و پێی گووتم: ((کرێکارانی جەنازە تۆزێکە هاتوون. دەچم پێیان دەڵێم تابوتەکە دابکوتن، دەخوازی جارێکی دیکەش دایکت بدینی؟)) گوتم نە. بەدەم دەنگ نزم کردنەوە بە تەلەفۆنەکە دەستووری دا: (( فیجاك بە مامورەکان بڵێ کە دەتوانن دەست بە

کار بن.)) ئەوجا گوتی کە ئەویش لە ڕێورەسمی ناشتنەکەدا بەشداری دەکات، سوپاسیم کرد. لە پشت مێزەکەیەوە دانیشت. لاقە بچوکەکانی نانە سەر یەك و پێی راگەیاندم کە تەنیا من و ئەو و لەگەڵ پەرستاری بەشەکەدا لە ڕێورەسمەکەدا دەبین، بە گوێرەی ڕێسای خانەی پیران، کەسانی پیرخانەکە بۆیان نییە بەشداری ڕێورەسمی ناشتن بکەن. تەنیا بۆیان هەیە شەو نەخوسی بکەن. و دووپاتی کردەوە کە:(( ئەمە مەسەلەیەکی ئینسانی یە.)) بەلاّم بە شێوەیەکی ریز پەڕ ڕێگەی بە دۆستێکی دایکم بە ناوی ((تۆماس پیریز)) دا بوو بەشداری لەم ڕێورەسمەدا بکات.بەڕێوەبەرەکە پێکەنی و پێی گووتم: ((بە خۆت دەزانی ئەمە هەستێکی هەرزەکارانەیە. ئەم پیرەمێردەو دایکت قەت لێکدی دوور نەدەکەوتنەوە. لە پیرخانەکەدا سوعبەتیان لەگەڵ دەکردن وبە(( پیرز))یان دەگوت: ((ئەمە دەزگیرانی تۆیە))ئەویش پێدەکەنی. ئەمەیان پێ خۆش بوو. وبەراستی مەرگی خات((مەرسۆ)) زۆری نارەحەت کردووە. وا زەندەکەم هەقی ئەوەم نەبوو ڕێگەی نەدەم. بەلاّم لەسەر راسپاردەی دکتۆری ئێشکچی، ڕێگەم نەدا شەو نخونی بەدیارەوە بکات.))

ماوەیەکی زۆر بە بێدەنگی ماینەوە. بەڕێوەبەرەکە هەستاو لە پە نجەرەی نووسینگەکەی خۆیەوە تەماشای کرد.وپاش تۆزێك گووتی: ((ئەها ئەوە قەشەی مارنگۆیە. زوو هاتووە.))و گووتی لێرەوە تا کلێساکە کە لە ناو گوندیدایە بەلای کەمەوە سێ چارەکە سەعات دەبێ. هاتینە خوارێ. کەشیشەکەو دوو مندالّی سروودخوێن لەبەر بینایەکەدا وەستابوون. یەکێك لە مندالّەکان بخورددانێکی بەدەستەوە بوو وکەشیشەکە بەرەو لای ئەو دانەوییووەوە تا درێژی زنجیرە زیوەکەی چاکبکات. کە ئێمە گەیشتینە جێ، کەشیشەکە سەری هەڵبڕی. بانگی کردم((کوڕەکەم)) وچەند قسەیەکی دیکەشی کرد. ئەوجا وەژوور کەوت، منیش وەدووی کەوتم.

تەمەشایەکم کرد دیتم کە بزمارەکانی تابووتەکە داکوتراوون. و چوار پیاوی رەشپۆش لە ژورەوە وەستاون، لەو دەمەدا گوێم لێ بوو کە بەڕێوەبەرەکە پێی گوتم گالیسکەکە لە کەنار جادەکەیەو ئامادەیە، کەشیشەکە کەوتە وێردو دوعا خوێندن. لەم ساتە بەدوواوە کاروبارەکان بەلەز جێ بەجێ بوون. پیاوەکان بە پەردەیەکەوە بەرەو تابووتەکە چوون. کەشیشەکەو هاورێکانی و بەڕێوەبەرەکەو من وەدەرکەوتین. ژنێك لەبەر دەرگا وەستابوو کە من نەمدەناسی. بەڕێوەبەرەکە گوتی: ((جەنابی مەرسۆ)). گوێم لە ناوی ژنەکە نەبوو وتەنیا ئەوەندەم زانی کە پەرستارە. ئەویش بێ هیچ بزەیەك دەمووچاوە رەقەڵەو درێژکۆلەکەی خۆی دانەواندەوە. ئەوسا ریزمان بەست تا جەنازەکە تێپەڕێ و لە دووی جەنازە هەڵگرەکانەوە وەرێکەوتین و لە خانەی پیرانەکە وەدەرکەوتین. گالیسکەیەك لەبەر دەرگا وەستابوو. رەش، درێژو بریقەدار بوو و قەڵەمدانی وەبیر بنیادەمدەهێنایەوە. لە تەنیشتییەوە ڕێکخەری ڕێورەسمەکە کە پیاوێکی کورتە بالاّبوو وجلێکی پێکەنیناوی لەبەردا بوو، لەگەڵ پیاوێکی رەفتار دەسکردا وەستابوون. زانیم پیرەمێردەکە ئاغای ((پیریزە)). کلاّوێکی نرمی قەراخ پانی ناوەند خڕی لەسەر بوو-کە لەکاتی تێپەڕبوونی جەنازەکەدا دایگرت-بە جلێکەوە کە پانتۆڵەکەی کەوتبووە سەر پێلاّوەکانی و گرێی بچووکی بۆینباخە رەشەکەی کە لە یەخە سپی کراسە دەڵبەکەی هاتبوو.لێوەکانی لە ژێر کە پوویەکی پڕ لە پەڵەی رەش دەلەرزی. قژە نەرم وسپییەکەی لە پشت گوێچکە سەیرەکانییەوە بەسەر قەراخە هەڵگەراوەکەیدا ڕژابوو ورەنگی سوری. گوێچکەکانی، لەسەر ئەم سیما رەنگ پەریوە سەرنجی راکێشام. ڕێکخەری ڕێو رەسمەکە شوێنی هەر

یەکەمانی دیاری کرد. کەشیشەکە لە پێشی پێشەوە دەرۆیی، ولە دوای ئەوەوە عەرەبانەکـە بـوو، لـە دەوری عەرەبانەکەدا ئەو چوار پیاوە بوو، لە دوای ئەوانەوە بەرێوەبەرەکەو من. پەرستارەکەو ئاغـای پیریـز لـە ریزی دوواوە بوون.

نهۆ ئاسمان نقوومی خۆرەتاو بوو. هەتاو وردە وردە قورسـایی دەخسـتە سـەر زەوی- گـەرما بەلـەز بـەرز دەبووەوە، نەمزانی بۆ ئەوەندە دێر حەرەکە تمان کرد. لە ژێر جلە تۆخەکا نمەوە هەستم بەگـەرما دەکـرد. پیرەمێردە وردیلە کورتە بالآکە کە کلاوەکەی لەسەر کردبوو دایگرتەوە. کاتێ کە بەرێوەبەرەکە باسی ئەوی بۆ دەکردم، ئاورێکم لێی دایەوەو تەمەشایەکم کرد، بەرێوەبەرەکە پێی گووتم کە زۆر جار دایکـم و مسـتەر پیریز عەسران لە گەڵ پەرستارێك دا بۆ پیاسە بۆ گوندەکە دەچوون. نۆڕیمـە دەشـتەکەی دەورو بـەرم، لـە نێو ریزی ئەو دار سنۆبەرانەی کە بە گردێکی زۆر بەرز کۆتایی دەهات ولە نێو ئەم زەوییە سـەوزو قـاوەیی و ئـەم ماڵـە تـاك تـاك و دیارانـەوە حـاڵی دایکـی خـۆم دە خوێنـدەوە. شـەو، دەبـێ لـەم دەڤـەرەدا وەکـو هەڵوەسـتەیەکی خەمئـەنگێز وەهـابێ. بـەلآم ئەمڕۆکـە هـەتاوی تاقەتبـەر، دیمەنەکـەی لەبـەر چـاو دەسڕییەوەو بێ گیان و خەمین دەینواند.

کەوتبووینە رێ. لەم کاتەدا بوو کە زانیم(( پیریز )) کـەمێك دەلـەنگێ. گالیسکەکە بەرەبـەرە خێراتـر دەبوو و پیرەمێرد دوا دەکەوت. یەکێك لەو پیاوانەش کە لە پـاڵ عەرەبانەکـەوە دەرۆیشـتن دواکـەوت ونهـۆ پێ بە پێی من دەرۆیی. پێم سەیر بوو کـە هـەتاو بـەو خێراییـە بـەرەو تـاقی ئاسمـان هەڵدەکشـا. لـە پڕ هەستم کرد کە دەشتەکە ماوەیەکە لە دەنگە دەنگی مێرووان وشنە شنی گیایاندا نقووم بووە.

ئارەقە بەگۆناکا نما هاتبووە خوارێ. چونکە کلآوم نەبوو، بەدەستەسڕ خـۆم بـاوەشـێن دەکـرد. مـاموری ناشتنەکە هەندێ شتی پێ گووتم کە گوێم لێ نەبوو. لەم کاتەدا ئارەقەکەی سەری خـۆی بـەو دەستەسـڕەی کە بەدەستی چە پییەوە بوو دەسڕی. بەدەستی راستی کاسکێتەکەی هەڵبڕی بوو. پێم گـووت: ((چـی؟)) بـە دەم ئاماژەکردنەوە بۆ خۆرەکە دووبارەی کردەوە کـە: ((گەرمایـەکی سـەیرە.)) گـووتم: ((ئـەرێ)). ((پـیر بوو؟)) گوتم: ((تەقریبەن))، چونکە تەمەنیم بەدروسـتی نـەدەزانی. دوای ئەمـە بێـدەنگ بـوو. ئـاورێکی پاشەوەم دایەوەو پیریز پە نجا مەترێك لە دواترەوە دەهات وهەروەها نیگایـەکی بەرێوەبەرەکـەم کـرد.زۆر بـە سـەنگ و ویقـارەوە رێـی دەکـرد. چـەند دڵۆپەئارەقەیـەك بەسـەر تەوێڵییـەوە دەبریقایـەوە، کەچـی نەیدەسڕی.

وام هاتە بەرچاو کە دەستەی بەرێکەران خێرا دەرۆیـی. دەوروبـەرم هـەمان دەشـتایی گـەرم وتـەژی خـۆر بوو. بۆ کەسێکی وەکو من لە کێشا نەبوو. بۆ ساتێك بەسەر بەشێك لە جادەکەدا کە تـازە نـۆژەن کرابـووەوە تێپەرین، خۆر قیری جادەکەی نەرم کردبووەوە.و پێی پێدا دەچوو وناواخنە درەوشاوەکەی بە دیار دەکەوت. کـلآوە چـەرمییەکەی عەرەبانچییەکە لەسـەر عەرەبانەکـەوە وا دەهاتـە بەرچـاو کـە لـەم قـوڕە رەشـە هەڵکێشرابوو. من لەنێوان ئاسمانی شین وسپی و هاوئاهەنگی ئەم رەنگانەدا: رەشی زەقـی قیرەکـە، رەشـی تۆخی جلەکان و رەشی بریقەداری عەرەبانەکەدا خۆم گوم کردبوو. هـەموو ئەمانـە: هـەتاو، بـۆنی چـەرم و بۆنی تەرس و شیاکەی عەرەبانەکە، بۆنی رەنگ وکندر، وماندوویـەتی یـەك شـەو بێـداری، نیگـاو بیریـان پەریشان کردبووم.جارێکی دی ئاوڕی پاشەوەم دایەوە: پیریـز زۆر دوور بـوو. لـەنێو شـە پۆلی گەرماکـەدا ون بووبوو. بەنیگا کەوتمە تاقیبی و بینیم لە ناوەندی دەشتەکەوەو بە رێگەیەکی قـەدبڕا دێت.سـەیرم کـرد

جادەكە لە بەردەم منا پێچ دەكاتەوە.ئیدی بـۆم دەكـەوت كـە پیریـز شـارەزای ئـەم دەڤـەرەیـە، وزۆر زووتـر رێگەكە تەی دەكات وئێمە دەگرێتـەوە. لـە پێچـی جادەكـەدا ئێمـەی گرتـەوە. دیسـان لێمـان گـوم بـووەوە. ئەمجارەش لە رێگەیەكی قەدبڕەوە دەرۆیی وئەم كارە چەند جارێك دووبـارە بـووەوە. بـەلاَم مـن هـەر زوو سەرنجم لەسەر جم وجوڵەكانی ئەو لاچوو. هەستم دەكرد خوێن لە لاجانگەكانمدا پل دەدا.

هەموو ئەمانە بەخێرایی و وەزع وحاڵێكی ئاسایی ئەوتۆ تێپـەرین كـە لەمـە پـتر شـێكی ئـەوتۆم لـەبیر نەماوە. ئا شتێكی دیكەش: كە چووینە ناو گوندەكەوە پەرستارەكە قسەی لە گـەڵ كـردم، دەنگـی لـە گـەڵ سیمایدا نەدەگونجا. دەنگێكی بەریتم ولەرزان بوو. گوتی ئەگەر بنیادەم هێدی بڕوات تـاوەسـووت دەبـێ، و ئەگەر لەزێ بكات ئارەقە دەكاتەوەو لەناو كڵێساكەدا سەرمای دەبێ)) راستی دەكردو هیچ چارێكی دیكـەش نەبوو، چەند بیرەوەرییەكی تری ئەو رۆژەم لەبیرە. بـۆ نموونـە سـەرو سیما پیریـز، كـاتێ بـۆ دواجـار لـە نزیكی گوندەكەدا پێمان گەییەوە، دڵۆپە ئارەقەی درشت، خەم و ماندوویەتی نیشتبووە سەر گۆناكانی كـە بەهۆی چرچ و لۆچەكانی دەمووچاوییەوە نەدەڕژا بەڵكو پەخش وبلاَو دەبووەو دووبـارە كۆدەبـووەوەو توێـژە ئـاوێكی لەسـەر ئـەم دەموچـاوە داتـە پیوە پێـك دەهێنـا، هـەروەها بـیرەوەری كڵێسـاو گونـدییانی سـەر شۆسـتەكان، گوڵدانـە سـورەكانی سـەر گۆڕەكـانی نـاو گۆڕسـتانەكە! لەخۆچـوونی ((پیریـز))(كـە وەكـو بووكەڵەیـەك دەچـووكە داوەكـەی پچـڕابێ) ئـەو گڵـەی كـە لـەرەنگی خـوێن دەچـوو ودەیـانكرد بەسـەر تـابووتەكەی دایكما، رەگ وریشاڵی دارو درەختان كە تێكەڵ بە گڵەكە بووبوو، هـەروەها ئـاپوراكـە، دەنگـە دەنگ و هەراو زەنا، گوندەكە، چاوەروانی لەبەر قاوەخانەیەكدا، دەنگی بەردەوامی مەكینەكەو خۆشـحاڵی من كاتێ كە پاسەكە گەییە ناو روناكییەكانی جەزایر و بیر كردنـەوەم لەمـەی كـە دوانـزە سـەعاتی خشـت دەنووم.

((٢))

كە لە خەو رابووم زانیم بۆچی بەرێوەبەرەكەم كاتێ كە داوای دوو رۆژ مۆڵەتم لێكرد قەڵس بوو: ئـەمڕۆ شەممەیە. هەر لەبیرم نەبوو، بەلاَم كە رابووم بیرم كەوتەوە. دیارە بەرێوەبەرەكەم وای بیر كردووەتەوە كە بە مجۆرە لەگەڵ یەك شەممەدا چوار رۆژ پشووم دەبێت و ئەمەی بە دڵ نەبووە. بـەلاَم خـەتـای مـن نییـە كـە لەبری ئەمرۆ دوێنێ دایكەیان بە خاك سپارد، ئەوجا هەر چۆنێ بێ شەممەو یەك شـەممەم پـێ دەبـڕا. لـە گەڵ ئەمەشا لە بەرێوەبەرەكەم دەگەم.

بە زەحمەت رابووم شەكەت و ماندووی دوێنێ بووم. بـەدەم ڕدێـن تـاشـینەوە لـە خـۆم پرسـی دەخـوازم چ بكەم و لێبڕام بچمە مەلەوانی. سواری تراموا بووم و چووم بۆ بەندەر. خۆم بە ئەستێڵەكەدا كرد. یەك دنیـا لاو ڕژابوونە ئەوێ. لە ئاوەكەدا ((ماری كاردونا))م بینی كە كات خۆی لـە دایەرەكـەمانـا تـایپێسـت بـوو، و ئەوسا حەزم لێی بوو. پێم وایە ئەویش بێ مەیل نەبوو. لێ زۆری نەبرد كە ئەو لێـی داو رۆیـی ودەرفـە تمان بۆ نەلوا كە زیاتر یەكدی بدینین. یارمەتیم دا كـە سـەربكەوێتە سـەر كەڵـەكێكی لاسـتیكی. و بـەدەم ئـەم كارەوە دەستم بەر مەمكی كەوت. من هێشـتا لـە ئاوەكـەدا بـووم كـە ئـەو بـەگازی پشـتا لەسـەر كەڵەكەكـە راكشا. رووی كردە لای مـن. قژەكـەی بەسـەر چـاویا رژابـوو و پێدەكـەنی. خـۆم گەیـانـدە كەڵەكەكـەو خـۆم

خزانده تەنیشتییەوە. هەواکەی خۆش بوو، و بـەنـاوی سـوعبەتـەوە سـەرم بـردە دوواوەوە رێـك لەسـر سكی ئەوم دانا. هیچی نەگووت، ومن بەو حاڵەوە مامەوە، هەر هەموو ئـاسمـان لـەنـاو چـاوەكـا نما بـوو، ئـاسمـان شین وزێڕین بوو. هەستم دەكرد دڵی ماری لە ژێر سەرمدا بە ئەسپایی لێدەدا. ماوەیـەك بـە نیمچـە بێـداری لەسەر كەڵەكەكە ماینەوە. كە هەتاو تەواو گەرم بوو ئەو خۆی هەڵدایـە ئـاوەكـەوەو منـیش بـەدوایا. خـۆم گەیانـدێ، دەسـتم لـە قـەدی هـالأنـدو پێكـەوە مەلـەمان كـرد. ئـەو هـەر پێدەكـەنی: كـاتێ كـە لەسـەر ئەسكەلەكە خۆمان وشك دەكردەوە پێی گووتم: ((من لە تۆ ئەسمـەرترم.)) داوام لێكـرد كـە شـەوێ پێكڤـە بچینە سینەما. بە پێكەنینەوە گووتی زۆر حـەز دەكـات فیلمێكـی ((فرنـانـدل)) بـدینێ. وەختـێ جلـەكـانم لەبەركرد زۆری پێ سەیر بوو كە بۆینباخی رەشم بەستووە. لێی پرسیم كە ئایا تازیە بارم؟ پێم گـووت كـە دایكم مردووە. چونكە دەیویست بزانێ كەی، وەڵامم دایەوە: ((دوێنـێ)) كـەمێك پەشـۆكا. بـەلأم خـۆی لـە گێلی داو هیچی نەگووت. دەمویست پێی لێم كە تەخسیری مـن نـەبووە. لێ جلـەوی خـۆم گـرت. چـونكە بـیرم كەوتەوە كە ئەم قسەیەم بە بەڕێوەبەرەكەم گوتبوو. ئەم دووبـارە كردنەوەیـەم پـێ بـێ مانـا بـوو. بەهـەر حاڵ بنیادەم هەمیشە كەمێك خەتاكارە.

شەوێ ماری هەموو شتێكی فەرامۆش كردبوو، هەندێ شوێنی فیلمەكە كۆمیـدی بـوو، بـەلأم بەشـێوەیەكی گشتی و بەڕاستی تورەهات بوو. لنگی بە لاقـی منـەوە چەسـپاندبوو. منـیش مـەمكیم دەگوشـی. لـە نزیكـی كۆتـایی فیلمەكەدا راممووسی. بەلأم بەدڵی خۆم نەبوو. كە چووینەدەرێ، لەگەڵ منا هات بۆ ماڵەوە.

كە ڕابووم ماری رۆیی بوو. بۆی رونكردبوومەوە كە دەبێ بچێ بۆ لای پوری. كە بیرم كەوتەوە ئەمڕۆ یـەك شەممەیە بێتاقەت بووم. حەزم لە یەك شەمموان نییە. لەناو جێگەكـەما تلـێكم دا. بـۆ بـۆنی ئـەو خوێیـە گەرام كە قـژی مـاری بەسـەر سـەرینەكەوە بـەجێی هێشـتبوو. تـا سـەعات دە لێـی خـەوتم. ئەوسـا بـەدەم ڕاكشانەوە تـا نیوەڕۆ هەر جگەرەم كێشا. تـاقەتم نـەبوو وەكـو چـەند رۆژە فـراڤین لـە نـك سیلسـت بخـۆم. چونكە پرسیاركووتیان دەكردم و منیش حەزم لەمە نەبوو. چەند هێلكەیـەكم كوڵانـد و هـەر لـەو قـاپـەداو بەبێ نان خواردم. چونكە نـانم لەماڵەوە نەبوو و تـاقەتم نەبوو بۆ نـانكڕین بچمە خوارەوە.

پاش فراڤین كەمێك بێتـاقەت بووم و كەوتمە پیاسە بە ماڵەكەدا. كاتێ كە دایكم لێرە بوو ماڵەكە رێك و پێـك بـوو، بـەلأم ئێسـتا بـۆ مـن زۆر گەورەیـە ودەبـێ مێـزی ژووری نـان خواردنەكـە بـۆ ژوورەكـەی خـۆم بگوازمەوە. من ئەم ژوورەم بەس بوو، تەنیا لەم ژوورەدا دەژیام لە نێو كورسییە حەسیرە چاڵ بووەكان و ئەو كۆمەدییەی كە ئـاوێنەكەی زەرد بووە و مێزی تەوالێتەكەو قەرەوێڵـە ئـاسـنەكەمدا. ئـەوەی دی هـەمووی بـێ سوود لەو گۆڕە كەوتبوو. دوای تۆزێك هەر بۆ ئەوەی كارێك بكەم، كۆنە رۆژنامەیەكم پەیدا كـردو كەوتمـە خوێندنەوەی. ریكلامێكی خوێی((كرۆشن))م لێ بڕی وچەسپاندم بەو دەفتەرەوە كە بـابەتـی سـەرنج راكێشـی رۆژنامانم تیا هەڵدەگرت. ئەوسا دەستم شتن و چووم لە بەلەكۆنەكە دانیشتم.

ژوورەكەم دەروانێتە شەقامە سەرەكییەكەی دەورو بەری شار. پاش نیوەڕۆیـەكی خـۆش بـوو. شـەقامەكە رەش دەچووەوە وتـاك و تـەرا خـەڵكی بە پەلـە تێدە پـەڕین. هـەوەڵین گـروپ، خێزانێـك بـوو كـە دەچـوونە گەشت، دوو كوڕیژگە بە جلی دەریاییەوە، و پانتۆڵەكانیان تـا خـوار ئـەژنۆیان هـاتبوو، لـەنـاو جلـە زبـرو رەقەكانیانا كەمێك نـارەحەت بوون. وكیژێكی چكۆلە بە قردێلەیەكی سورو جوتێ پـێڵاوی بریقـەدارەوە لـە دوایانەوە بوو. دایكیان قەڵـەو بـوو، كراسێكی حـەریری قـاوەیی لەبـەر بـوو. بـابیـان پیـاوێكی وردیلـەی

یەجگار لاواز بوو ودووراو دوور دەمناسی، کلاوێکی حەسیری لەسەر بوو. بۆینباخی لەمل کردبوو ودارعاسایەکی بەدەستەوە بوو. کە ئەوم لەگەڵ ژنەکەیدا بینی، ئیدی زانیم بۆچی لە گەرەکا دەڵێن پیاوێکی بەئیحتوبارەو ژنەکەی لە ڕێزەی ئەودانییە. دوای تۆزێك گە نجانی دەڤەرەکە، بە قژی کرێماوی وبۆینباخی سورو چاکەتی ناوقەدتەنگی گوڵدۆزی و پێلاوی نووك پانەوە ڕەت بوون. پێدەچوو بۆ سینەمای ناوەندی شار بچن. بۆیە زوو کەوتبوونە ڕێگەو بەدەم قاقای پێکەنینەوە دەلەزین کە فریای تراموا بکەون.

دوای ئەوان شەقامەکە بەرە بەرە چۆڵ بوو. پێم وایە لە هەموو شوێنەکانا نمایش دەستی پێکردبوو. جگە لە دوکانداران و پشیلە چ شتێکی دی لە شەقامەکەدا نەدەبینرا. ئاسمانی سەر ریزە درەختەکانی ئەم بەر وئەوبەرە شەقامەکە ساف بوو بەلام روناك نەبوو. لە شۆستەکەی ئەوبەرەوە کابرای جگەرە فرۆش کورسییەکی هێنایە دەرێ. لەبەر دوکانەکەیا دایناو هەردوو دەستی خستنە سەر پشتی کورسییەکەو بە بەرەواژی لەسەری دانیشت. ئەو ترامواییانەی کە تا تۆزێ لەمە پێش پڕبوون لە خەڵکی ئێستا تەقرییەن چۆڵ بوون. لە قاوەخانە بچووکەکەی(( شیە پیرۆ ))ی تەنیشت جگەرە فرۆشەکەوە گارسۆنەکە خەریك بوو ئاردە داری نێو هۆڵە چۆڵەکەی دەمالی. بەڕاستی یەك شەممە بوو.

منیش کورسییەکەی خۆم وەرگێڕاو وەکو جگەرە فرۆشەکە لەسەری دانیشتم. چونکە هەستم کرد واهی خۆشترە. دوو جگەرەم کێشا. چوومە ژوورەوەو چکلێتێکم هێناو چوومە بەر پە نجەرەکە تا لەوێندەر بیخۆم. دوای تۆزێك ئاسمان تاریك بوو و بە دڵما هات کە هەر ئێستا بارانە هاوینەیەك دادەکات. کەچی پەڵە هەورەکان بەرە بەرە ڕەوینەوە. لێ تێپەڕبوونی هەورەکان بەسەر شەقامەکەدا بۆنی بارانی لێدەهات و زیاتر تاریکی کرد. ماوەیەك روانیمە ئاسمان.

سەعات پێنج، ترامواییەکان بە هەراو زەناوە پەیدابوونەوە. لە مەیدانی وەرزشی دەوروبەری شارەوە تەماشاڤانانی فوتبۆڵیان کە وەکو هێشوو خۆیان بە پەیژەو قەراخەکانیانەوە هەڵواسی بوو، دەهێنایەوە. ترامواکانی دی وەرزشکارەکانیان پێ بوو کە من بە جانتا چکۆلە کانیانا ناسیمنەوە. تا هێزیان تیا بوو دەسترین وهاواریان دەکرد کە یانەی ئەوان نادۆڕێ. ژمارەیەکی زۆریان بەسەر وبەدەست ئاماژەیان بۆ کردم. یەکێکیان هاواری بۆ کردم: (( بردمانەوە ))و لە وەلاما سەرم بۆ جولاندن و گووتم: (( ئافەرین )). لەمە بەدوواوە هاتو چۆی ئۆتۆمۆبیلی تایبەتی سەری کرایەوەو رووی لە زیادی کرد.

ئاسمان هەمدیس کەمێك گۆڕا. لەسەربانەکانەوە ئاسمان سوور دەچووەوە، ولەگەڵ زەردە پەڕی ئێوارێدا کە بەرێوە بوو جم وجوڵ کەوتە نێو کوچەو کۆلانەکان، گەشتیاران کەم کەم دەگەڕانەوە، ئاغای بە ئیحتوبارم لە نێو قەرەباڵغییەکەوە ناسییەوە. منالەکان دەگریان و خۆیان بە عاردی دا بکێش دەکرد. لەو دەمانەدا سینەماکانی گەڕەك، شە پۆلە تەماشاڤانێکی زۆریان هەڵڕشتە سەر شەقامەکە. هەندێ گە نجیان تیا بوو کە ئەتواریان جدیتر لە ئاسایی بوو، پێدەچووفیلمێکی سەرکێشیان بینی بێ. ئەوانەی چووبوونە سینەماکانی شار کەمێ درەنگتر گەیشتنەوە. ئەوانە جدیتر دەهاتنە بەرچاو وهێشتا هەر پێدەکەنین. بەلام جار جارێ ماندوو و خەیالاوی دەیان نواند. بە شۆستەکانا دەهاتن و دەچوون. کیژۆلانی گەڕەك بەسەری رووتەوە دەستی یەکیان گرتبوو، کوڕەکان ریزیان بەستبوو تا ریزەکەی ئەوان بشکێنن. و تالیقیان لێدەدان وکیژەکان سەریان وەردەگێڕاو پێدەکەنین. هەندێکیان کە دەمناسین بەدەست و سەر ئاماژەیان بۆ کردم، سلاویان کرد.

لە پڕ گڵۆپەکانی سەر شەقامەکە هەڵبوون و ئەستێرەکانی سەرەتای شەویان لە جریوە خست. هەستم کرد چاوەکانم لە تەمەشای شۆستە پڕ لە خەڵکەکەو ڕووناکییەکە ماندوو بوون. تیشکی گڵۆپەکان ڕژابووە سەر شۆستە تەڕەکەو لایتی ترامواپەکان لە مەودایەکی دیارەوە دەیدا لە قژی درەخشان، لەبزەیەك، یا لە بازنێکی زیو. دوای کەمێك ترامواپەکان کەم بوونەوە، تاریکی شەو باڵی بەسەر درەختەکانا کێشاو گڵۆپەکان کوژانەوە، و گەڕەك بەرەبەرە چۆڵبوو، بەرادەیەك کە یەکەمین پشیلە بە هێواشی لەو شەقامەوە کە تازە چۆڵ بووبوو تێپەڕی. هەنگێ بیرم کەوتەوە کە دەبێ شێو بخۆم. گەردنم، چونکە ماوەیەك بوو نابوومە سەر قەراخی کورسییەکە کەمێك دەیەشا. چوومە خوارەوەو نان و پیێخۆرم کڕی. خواردنم لێناو هەر بەسەر پێوە شێوم خوارد. ویستم لەبەر پەنجەرەکەدا جگەرەیەك بکێشم. لێ دنیا سارد بوو بوو وکەمێك سەرمام بوو. پەنجەرەکەم داخست و گەڕامەوە، لە ئاوێنەکەدا سووچێکی مێزەکەم بینی کە چرا سپرتۆییەکەو هەندێ گوێچکە نانی لەسەر بوو. بیرم کەوتەوە کە ئەم یەك شەممەیەش وەکو یەك شەممەکانی دی بوری ودایکم نهۆ لەژێر خاکدایەو سبەینێ سەر لەنوێ دەچمەوە سەر سەر کارو وەلحاسڵ چ گۆڕانێك ڕووی نەداوە.

((٣))

ئەمڕۆ لە دایەرە زۆرم کار کرد. بەرێوەبەرەکەم میرەبان بوو بوو. لێی پرسیم ئایا زۆر ماندوونیم؟ ودەیویست تەمەنی دایکم بزانێ. بۆ وەی بەدرۆ نەکەومەوە گوتم: ((شەست ساڵێك دەبوو)) و نازانم بۆچی وای دەنواند سەرخۆشی لێکردوم و شتەکە بڕاوەتەوە.

کۆمەڵێك بارنامە لەسەر مێزەکەم کەڵەکە بوو بوو دەبوایە بە هەموویانڕا بگەم. بەر لەوەی بۆ فراڤین لە دایەرە دەربچم، دەستەکانم شت. نیوەروان ئەم کاتانەم لە لا خۆشە. بەلاَم ئێواران کەمتر حەزی لێدەکەم چونکە ئەو خاولییەی کە دەبێ بەکاری بێنم تەڕی تەرە، چونکە بە درێژایی ڕۆژەکە بەکار هاتووە. ڕۆژێك ئەمەم بە بەرێوەبەرەکەم گووت، وەلاَمی دامەوە کە مایەی داخە، بەلاَم لە هەمان کاتا چ نییە. سەعات دوانزەو نیو لە گەڵ((عەمانۆئیل))دا کە لە بەشی ناردنی نامەکانا کار دەکات وەدەرکەوتین. دایەرەکەمان دەروانێتە سەر دەریا و ئێمەش بۆ چەند ساتێ وەستاین و کەوتینە تەمەشای کەشتییە بارهەڵگرەکانی بەندەر کە نقومی هەتاو بوو. لەم کاتەدا کامیونێك بە هاڕەهاڕ هات. عەمانۆئیل گووتی: ((بەم بڕۆین؟))و من دەستم بەغاردان کرد. کامێنەکە لێمان ڕەت بوو وئێمە دووی کەوتین. من لە ناو هاڕە هاڕو تەپو تۆزا غەرق بووم. هیچم نەدەبینی و هەستم بە هیچ نەدەکرد جگە لە تەکانی ناڕێکی غاردانی خۆم بە نێو ئاپورای سیلینگ و ترومبێل، و ئەو ریکانەی لە دوورەوە دەرەقسین و بۆدی ئەو کەشتیانەی کە بە لایاندا ڕەت دەبووین. هەوەڵجار من گەییمە لۆرییەکەو خۆم هەڵدایە ناوی. ئەوجا کۆمەکی عەمانوئیل_م کردو ئەویش سوار بوو. هانکەهانکمان پێ کەوتبوو. لۆرییەکە بەسەر شۆستەی ناهەمواری لەنگەرگاکەوە، بە نێو تە پوتۆزو هەتاوا هەڵبەز و دابەزی دەکرد. عەمانوئیل لە کانگای دڵەوە پێدەکەنی.

گەیینە خواردنگەکەی ((سلست)) ئازای بەدە نمان لە ئارەقەدا هەڵکشابوو. ئەو وەکو هەمیشە، بە ورگی زل ز بەرکۆشە لەبەرو بە سمێڵە چەرمووەکەیەوە لەوێندەر بوو. لێی پرسیم کە:(( بە گشتی حاڵم باشە

؟ )) وەڵامم دایەوە بەڵێ، و گوتم برسیمە. بەلەز نـانم خـواردو قاوەیـەکم بـە سـەرا کـرد. ئەوسـا بـۆ مـاڵ گەڕامەوە. چونکە شەرابێکی رەم خواردبووەوە کەمێك نووستم. کە ڕابووم حەزم لە جگـەرە بـوو، درەنـگ بـوو بوو. بۆ وەی بە ترامودادا بگەم، هەڕام کرد. بە درێژایی دوا نیوەڕۆ کارم کرد. لە دایەرە دنیا فرە گـەرم بـوو، و عەسر کە وەدەرکەوتم خۆشحاڵ بووم کە هێدی هێدی بـە پیاسـە بـە قـەراخ بارەندازەکـەدا بگەڕێمـەوە. ئاسمان سەوزباو بوو. مـن دڵخـۆش بـووم. وێـرای ئەمـەش یەکڕاسـت بـۆ مـاڵ گەڕامـەوە، چـونکە دەمویسـت پەتاتە بکوڵێنم.

کاتێ کە سەردەکەوتم، لەسەر پلیکانە تـاریکە تووشی سالامانۆی پیر، دراوسێی دیوار بە دیوار بووم. لـە گەڵ سەگەکەیدا. هەشت دانە ساڵە ئەم جووتە پێکـەوە دەبینـرێن. سـەگەکە تووشـی نەخۆشـییەکی پێسـت بووە، پێم وایە گەڕییە، هەموو تووکەکەی وەریوەو لەشی یەکپارچە پەڵەی قاوەییە. سالامانۆی پیر هێندە بەتەنێ لەگـەڵ ئـەم سـەگەدا لـە یـەك ژوور ژیـاوە، بەرەبـەرە شێوەی ئـەوی وەرگرتـووە. ئـەویش پەڵـەی سووربـاوی بە دەمووچاوەوەیە و قژی زەردبـاو و تەنکـە. سـەگەش لـە خاوەنەکەیـەوە فێربـووە کـە قـە پۆزی رەپێش بخات و ملی درێژ بکات و بە کوورە کوور ڕێ بکات. لە تۆ وایە لەیەك نەژادن، بـەلام لـە یـەکتریش بێزارن. پیرەمێرد رۆژی دوو جاران ،سەعات یازدەو سەعات شەش سەگەکەی بۆ گەڕان دەبـاتن، هەشـت دانـە ساڵە ڕێگەی خۆیان نەگۆڕیوە. لە شەقامی لیۆن دا دەبینرێن. سەگەکە بـەجۆرێ خاوەنەکـەی بکـێش دەکـات کە سالامانۆی پیر پێی تێك دەئالێت وسا تمە دەدات. ئیدی دەکەوێتە وێزەی سەگەکەی و جنێـودانی. سـەگە لە داخانا مت دەبێ و مل دەدا. هەنگێ نۆرەی پیرەمێرد دێ کە سەگەکە بە دووی خۆیا بکێش بکات وکە سەگە ئەمەی بیر دەچـێتەوە هەمـدیس دەکەوێتـە بکـێش کرنـی خاوەنەکـەی وهەمـدیس کوتـەك دەخـوات و جنێـو دەژنەفێ. هەنگێ هەردووکیان لە کەناری شۆستەکە دەوێستن و سەگەکە بەترس و پیاوەکە بە ڕقەوە نیگـای یەکدی دەکەن. ئەمە کاری هەموو رۆژێکیانە. هەر کاتێ سەگە بخوازێ بمیزێ، پیرە مێرد دەرفەتی نـادات و بە دووی خۆیا ڕایدەکێشێت. ئەگەر جارجارێ ئەم کارە لەژوورەوە بکات دیسان کوتەك دەخوات. هەشت دانـە ساڵە کە ئەم کارە بەردەوامە. سلست هەمیشە دەڵێت کە(( بەدبەختە )) بەلام راستیەکەی کەس نازانێت. کـە لەســەر پلیکانەکــە توشــی بــووم (( ســالامانو )) خــەریك بــوو جنێــوی بــە ســەگەکەی دەدا. پێــی دەگوت:(( چە پەڵ!، بۆگەن! ))و سەگەکە دەیقروسکاند. پێم گوت:(( شەوباش )) لێ پیرەمێرد لەسەر جنێوی خۆی بوو. هەنگێ لێم پرسی کە سەگەکە چی کـردووە، وەڵامـی نەدایـەوە، بـەردەوام دەیگـوت:(( نـەگریس! بۆگەن! )) هەستم کرد کە پیرەمێردەکە بەسەر سەگەکەیا دانەویوەتەوە و قرێتەکەی رێك دەخاتەوە. دەنگم بەرزتر کردەوە. هەنگێ بێ ئەوەی ئـاوڕ بداتـەوە، بەجۆرە تورەییەکی جڵەوکراوەوە، وەڵامی دامەوە:(( ئەمـە کاری هەمیشەیەتی. )) ئەوجا بەدەم بکێش کردنی سەگەکەوە، کە لەسەر هەر چوار دەست و پێیـان بـەرگری دەکرد، کەوتە ڕێ.

ڕێك لەم کاتەدا دووەم دراوسێی دیوار بە دیوارم وەژوور کەوت. لە گـەڕەکا وا بـاوە کـە بـە گـەوادی دەژی ئەگەر جار جارێ کەسێك لێی بپرسێت چ کارەیە، دەڵێـت (( دوکانـدارە )). بـە شێوەیەکی گشـتی چ کەسـێك خۆشی نەگەرەکە. بەلام زۆرجاران قسەم لەگەڵدا دەکات و جارجـارێ سـەرێکم لـێ دەدات، چـونکە گـوێی لێ دەگرم. قسەکانیم پێ سەیرو خۆشە. ئەمە جگە لەوەی کە هیچ هۆیەك نییە کەقسەی لە گەڵ نەکەم. نـاوی ڕیمۆن سنتس_ە. کورتە بـالایەکی نـاوشان پانی کە پووفشەوەکو کە پووی بۆکسوانان. هەمیشە ڕێـك پۆشـە.

رۆژێك باسی سالامانۆی بۆ كردم وگووتی :(( ئەمە كەسێكی نەگبەتە )) لێی پرسیم ئایا لێی بێزار نیم، وەلاّمم دایەوە نە.

سەركەوتینە سەرێ و خەریك بوو لێی جیا دەبوومەوە كە هەلّیدایێ: (( سوسیس وشەرابم لە مالّەوە هەیە. مەیلت لێیە پارویەك پێكەو بخۆین؟..))بیرم كردەوە كە قبولّكردنی ئەم دەعوەتە هیچ نەبێ زەحمەتی خواردن لێنانم لە كۆلّ دەكاتەوەو گووتم باشە. ئەویش تەنیا ژوورێك و موبەقێكی بێ پە نجەرەی هەیە. لە سەرووی تەختە خەوەكەیەوە، پەیكەری فریشتەیەك لە مەرمەڕی قەلّبی مەیلەو سپی وسوور، چەند وێنەیەكی قارەمانانی وەرزش ودوو یا سێ وێنەی ژنانی ڕووت هەبوو. ژوورەكەی پیس و تەختە خەوەكەی پەشێو بوو. هەوەلّجار چرا نەوتییەكەی هەلّكرد. ئەوجا پارچە سارغییەكی زۆر چلّكنی لە بەرگی دەرهێنا ودەستی راستی خۆی پێ پێچا. لێم پرسی چییەتی؟ گوتی لەگەلّ یارۆیەكدا كە گەڕی پێدەكرد، بەشەڕهاتووە.گوتی: (( بەخۆت ئاگاداری جەنابی مەرسۆ، من شەڕانی نیم بەلاّم هەستیارم.)) یارۆ پێی گووتم: (( ئەگەر پیاوی لە تراموایەكە وەرە خواری.)) پێم گووت: (( بڕۆ بەرێی خۆتا و ئاقلّ بە.))ئەوجا پێی گووتم كە پیاو نیم. هەنگێ دابەزیم و پێم گووت: (( زارت لێكنێ، بۆ خۆتمە دەنا دەتكەم بە بنیادەم.))وەلاّمی دایەوە: (( تڕحێو )) هەنگێ یەكێكم خێواندێ. كەوت. چووم هەلّیبسێنمەوە، كەچی هەر لەسەر عاردەكەوە چەند لەقەیەكی پێدا كێشام. ئیدی منیش بە ئەژنۆ پێی بەربووم ودوو دانە سیخورمەم پێدا كێشا. دەمووچاوی خلّتانی خوێن بوو. لێم پرسی پیاو بووی؟ گووتی: (( بەلێ )) بەدرێژایی ئەم ماوەیە (( سنتس )) سارغییەكەی دەبەست. من لەسەر تەختەكە دانیشتبووم. گووتی: (( بەخۆت دەبینی كە هەقم بەسەرییەوە نەبووە، ئەو هەوەلّجار شەڕی پێفرۆشتم.)) ئەوسا پێی گووتم كە پێویستی بە ئامۆژگاری منە لەو بارەیەوە، گوایە من پیاوم، ئاشنای ژیانم، وەدەتوانم كۆمەكی بكەم ئەمە جگە لەوەی كە رەفیقی منە. من هیچم نەگووت ودووبارە لێی پرسیم كە ئایا دەمەوێ رەفیقی بم؟ لە وەلاّما گووتم هیچ فەرقێك ناكات. خۆشحالّ بوو. سویسەكەی دەرهێنا. لە تاوەدا سووری كردەوە، پەرداخ وقاپ وچەقۆو چەتالّ و دوو قاپ شەرابی لەسە مێزەكە دانا. هەموو ئەم كارانەی بەبێ دەنگی كرد. ئەوجا دانیشتین. لەسەر نان خواردن كەوتە باسی بەسەرهاتەكەی خۆی. هەوەلّجار تۆزێ دوودلّ بوو: (( دۆستایەتیم لەگەلّ ژنێكدا هەبوو.. دەشێت بگوترێ ماشووقەم بوو.)) ئەو پیاوەی لە گەلّی بەشەڕ هاتبوو برای ئەم ژنە بوو. گووتی كە خەرجی ئەم ژنەی دەكێشا. هیچم نەگووت. بەخۆی لەسەری رۆیی و گووتی كە ئاگای لێیە خەلّكی گەرەك چ دەلّێن، بەلاّم ئەو بابایەكی دوكانداری نیازپاكە. پێی گووتم: (( بابێینەوە سەر بەسەرهاتەكەم. زانیم كە فێلّ وكەلّەكێك لە ئارایە.)) بە ئەندازەی پێویستی بەم ژنە دەدا. كرێی ژوورەكەی بۆ دەداو رۆژی بیست فرانكی بۆ خۆراكی رۆژانە دەدایێ: سێسەد فرانك كرێی ژوورەكە، شەش سەد فرانك خەرجی رۆژانە، ناوبەناو جووتێ گۆرەوی. هەمووی دەیكردە هەزار فرانكێك و خانم هیچ كارێكی نەدەكرد. بەلاّم لێكدا لێكدا پێی دەگووتم كە ئەم بڕە پارەیە بەشی ناكات. منیش پێم دەگووت: (( بۆچی تاقێك كارناكەیت؟ بەمە من لە شەڕی ئەم وردە خەرجیانە رزگار دەكەی. ئەم مانگە دەستە جلێكم بۆ كڕیوی. رۆژی بیست فرانكت دەدەمێ، كرێی ژوورەكەت بۆ دەدەم وتۆش پاش نیوەروان لەگەلّ دەستە خوشكەكانتا دادەنیشیت و قاوە دەخۆیتەوە، قاوەو شەكریان دەدەیتێ و من پارەت دەدەمێ. من چاكەم

لەگەڵ کردوویت وتۆ بە مجۆرە چاکەم دەدەیەوە. بەڵام ئـەو کـاری نـەکردو نـەکرد. هەمیشـە دەیگـووت ئـەم پارەیە بەشی ناکات و ئیدی زانیم کە فێڵ و تەڵەکەیەك لەم کارەیدا هەیە.))

ئەوجا بۆی گێڕامەوە کە بلیتێکی یانەسیبی لە جانتای ماشوقەکەیدا دۆزیوەتـەوە کـە نـەیتوانیوە بـۆی روون بکاتەوە کە چۆنی کڕیوە. دوای ماوەیەك لە ژوورەکەیدا وەسڵێکی بارمتـەی دۆزیـوەوە کـە دوو بـازنی خستبووە رەهنەوە، و ئەو تا ئەوکاتە، لەبوونی ئەو بازنانە بێ ئاگابووە. ((تەواو دڵنیا بووم کـە فێڵێـك لەم کارەدا هەیە. ئیدی وازم لێهێنا، بەڵام لە پێشا هەندێکم لێدا. ئەوسا هەموو عەیبـەکانیم دایـەوە بـە چاویا پێم گووت تۆ تەنیا ویستووتە کۆشت گەرم بکەی. هەروەها پێم گووت، بەخۆت حاڵی دەبـی جـەنابی مەرسۆ، گووتم: ((تۆ نازانی کە خەڵکی بەغیلی بەو خۆشی وشادییەت دەبەن کە من پێتی دەدەم. تۆ دوایـی قەدری ئەم شادیەت دەزانی.))

ئە مجارە خرا پی لێدابوو. پێشتر لێی نەدەدا.((لێم دەدا، بەڵام بە هێواشی. تۆزێکی هاوار دەکرد. و مـن پە نجەرەکانـم دادەخست و لێرەدا دەبڕایەوە. لێ نهۆ مەسەلەکە جدییە. و پـێم وایـە هێشـتا بـە تـەواوەتی تەمێم نەکردوو.))

هەنگێ رونیکردەوە کە پێویستی بە تەگبیری کەسێکە. وەستا تا فتیلەی چراکە کە دووکەڵی دەکرد چـاك بکات. من بە درێژایی ئەو ماوەیە گوێم لێدەگرت. نزیکەی قا پێك شەرابم خواردبووەو هەستم دەکرد سـەرم زۆر گەرم بووە. چـونکە جگـەرەم پـی نـەمابوو لـە جگـەرەکانی( ریمـۆن)م دەکێشـا. دوا ترامـوا تێدەپـەڕین وهەراو هەنگامەی شاریان کە نهۆ نیشتبووەوە لە گەڵ خۆدا دەبرد. ریمۆن لەسەری رۆیی: ئەوەی کـە ئـازاری دەدا ئەمەیە کە هێشتاش هەوای هاوئاغۆشی ماشوقەکەی لە سەردا بوو. لە گەڵ ئەوەشا دەیویست تـەمبێی بکات. هەوەڵجار بیری لـەوە کردبـووەوە کـە بـۆ ئـوتێلێکی بـەرێت و پۆلیسـی بـەرەنگار بوونـەوەی تـاوانی ئەخلاقی بۆ بانگ بکات، تا هەرایەك بناتەوەو کارێکی وەهـا بکـات بەسـۆزانی فـەرمی لەقەڵـەمی بـدەن. پاشان چووبووە لای هەندێ برادەری کە لەو بوارەدا کاریـان دەکـرد. ئەوانـە بیریـان بـە هـیچ کـوێ نەگـەیی بوو. بۆیە ریمۆن پێی گووتم، خۆ ئەگەر ئەهلی تەقلیش بی ئەم سەریەشانە هەر هەیە. ئـەم مەسـەلەیەی بە هاوڕێکانی گوتبوو، و پێشنیازی ئەوەیان بۆ کردبوو کە داغمەی پێوە بنێ، بەڵام ئەمـەی بـەدڵ نـەبوو، بۆیە دەیویست بیرێك بکاتەوە. پێش ئەمە داوایەکی لە من هەبوو. بەر لەداواکەی، دەیویست ڕای من لەمـەڕ ئەم ڕووداوە بزانێ. پێم گـووت هـیچ رایـەکم نییـە، بـەڵام سـەیرە. پرسـی ئایـا تەفرەیـەك لـەم ڕووداوەدا نابینم؟ من پێم وابوو کە تەفرەیەك لە کارەکەدایە. پرسی ئایا بە باوەڕی من ژنە شایانی تـەمبێ کردنـە، و گەر من لەجیاتی ئەوبام چم دەکرد. گوتم پیاو هەرگیز نـازانێ، بـەڵام لـە حـەزی وی بـۆ تـەمبێ کردنـی ژنەکە دەگەم. هەندێ شـەرابی دیکـەم خـواردەوە، جگەرەیـەکی پێکـردو نەخشـەکەی خـۆی بـۆ بـاس کـردم. دەیویست نامەیـەکی بـۆ بنووسـێت ((هـەم پـڕ تانـەو تەشـەر بـێ وهـەم پەشـیمانی بکاتـەوە)) ئیـدی کـە گەڕایەوە لای، لەگەڵیا بخەوێ و((هەرکە لە کارەکەی بووەوە)) تفـێ بکاتـە چـارەی و لـە دەرگـاوە وەدەری بنێ. لێ ڕیمۆن گووتی نازانێ نامەیەکی گونجاو بنووسێت و وای بەبیرا هاتبوو کە من نامەکەی بۆ بنووسم. چونکە هیچم نەگووت، لێی پرسیم ئایا بۆ من زەحمەتێکی تیایە کە ئێسـتا نامەکـە بنووسـم و مـن وەڵامـم دایەوە کە نەخێر.

ئەوسا دوای خواردنەوەی پەرداخێك شەراب هەستا. قاپەكان و تۆزێ پاشماوەی ساردەوەبووی سوسیسی كە مابووەوە، لابرد. بە وردی سەر مێزەكەی پاك كردەوە. لە چەكمەجەی كۆمەدی تەنیشت تەختە خەوەكەیەوە كاغەزێكی خانەخانە، زەرفێكی زەرد، قەڵەمێكی داری سورباوو شووشەیەكی چوار گۆشەی مەرەكەبی وەنەوشەیی دەرهێنا. كە ناوی ئافرەتەكەی پێگووتم زانیم كە خەڵكی جەزایرە. نامەكەم نووسی، كەمێك سەرڤەسەرڤە نووسیم. بەلاّم هەوڵمدا ریمۆن رازی بكەم چونكە هیچ هۆیەك نەبوو كە زویری بكەم. ئەوجا نامەكەم بەدەنگی بەرز خوێندەوە. بەدەم جگەرەكێشان و سەرلەقاندنەوە گوێی دەگرت.ئەوسا داوای لێكردم كە دووبارە بۆی بخوێنمەوە.زۆری بە دڵ بوو. گووتی : (( دەمزانی كە تۆ ژیان دەناسیت. )) هەوەڵجار ئاگام لێنەبوو كە بە(( تۆ )) دواندمی. كاتێ بە ئاگا هاتم كە گووتی: (( نهۆ تۆ هاورێی راستەقینەی منی ))رستەكەی دووبارە كردەوەو من گووتم : (( بەڵێ )) بۆ من هیچ فەرقێكی نەدەكرد كە هاورێی بم یان نا. بەلاّم بەراستی دیار بوو كە ئەو ئارەزووی ئەم هاورێیەتییەی هەبوو. نامەكەی داخست و شەرابەكەمان تەواو كرد. ئەوجا ماوەیەك بەبێدەنگی جگەرەمان كێشا. دەرەوە كپ وئارام بوو. گوێمان لە دەنگی سورانەوەی ئۆتۆمۆبیلێكی رەوتەنی بوو. گووتم : (( درەنگە )) بەلای ریمۆنیشەو هەروابوو. گووتی كات چەند خێرا دەروات، لەروویەكەوە راستی دەكرد. من خەوم دەهات، هەستم دەكرد بەزەحمەت دەتوانم هەستم. بێگومان سەروسیمایەكی ماندووم هەبووە. چونكە ریمۆن پێی گووتم نابێ ورە بەربدەم...لەسەرەتاوە حاڵی نەبووم، ئەوسا بۆی رونكردمەوە كە بە مردنەكەی دایكمی زانیوە. بەلاّم ئەم شتە ئەمرۆبا یا سبەی هەر دەبووایە روو بدات. منیش هەمان بۆچوونم هەبوو.

هەستام، ریمۆن دەستی توند گوشیم وگووتی پیاوان هەمیشە لە قسەی یەكدی دەگەن. كە لە ژوورەكەی هاتمە دەرێ، دەرگاكەم داخست و بۆ ساتێك لە تاریكی رارەوەكەدا وەستام. ماڵەكە كپ و هێدی بوو ولەبنی پلیكانەكانەوە شنەیەكی تاریك وشێدار دەهاتە سەرێ. جگە لە پلدانی خوێنەكەم كە لە گوێمدا دەنگی دەدایەوە، چ دەنگێكی دیكەم نە دەژنەوت. جوڵەم لێوە نەدەهات. بەلاّم لە ژوورەكەی سالامانۆی پیرەوە سەگەكە بەدەنگێكی كپ قروسكاندی.

(( ٤ ))

بەدرێژایی ئەم هەفتەیە كارێكی زۆرم كرد. ریمۆن هاتە لام و گووتی نامەكەی ناردووە. دووجاران لەگەڵ عەمانۆئیل دا چوومە سینەما، هەرگیز لەوە حاڵی نەدەبوو كە بەشاشەكەدا رەت دەبوو. دەبوایە بۆی شەرح بكەم. دوێنێ شەممە بوو، ماری لەسەر ئەو وەعدەی دامانناببوو هات. زۆرم دڵ چووە سەری. چونكە كراسێكی جوانی موقەلەمی سورو سپی لەبەر كردبوو وجوتێ پێلاّوی چەرمی لە پێدا بوو. مەمكە توندەكانی لە ژێركراسەكەیەوە سەرەتاتكێی دەكرد، ودەمووچاوی تاوانگازی لە گوڵ دەچوو. سواری پاس بووین و چووین بۆ چەند كیلۆمەتری جەزایر بۆ كەنارێك ( پلاژ ) كە تاوێرە بەردان دەوریان دابوو و لایە وشكەكەی نە یجەزار بوو. هەتاوی سەعات چوار زۆر گەرم نەبوو، بەلاّم ئاوەكە بەدەم وردە شە پۆلانی درێژو خاوەوە شلەتێن بوو. ماری یارییەكی فێر كردم. دەبوا بەدەم مەلەوە كەفی سەر شە پۆلەكان لەزاری خۆدا كۆبكەیەوەو یەكسەر بكەویە سەر گازی پشت و كەفەكە بەرەو ئامان بپرژێنی. كەفەكە وەكو تۆرێكی تەنك وناسك لە حەوادا مەحوو دەبووەوە یان وەكو بارانێكی شلەتێن بەسەر دەموچاوتا دادەبارییەوە. بەلاّم زۆری

نەبرد سوێری وتاڵی خوێیاو زاری سوتاندمەوە. هەنگێ ماری خۆی گەیاندمێ و لە ناو ئاوەکەدا دەستی لە ملم وەرینا. زاری نایە سەر زارم. بە زمان لێوە سووتاوەکانی تەڕکردمەوەو ماوەیەك بەو جۆرە لەنێو شە پۆلاندا تە پاو تلمان دا.

کە لە پلاژەکەدا خۆمان لەبەر کرد، ماری بەچاوانی پڕشنگدارەوە لێی ڕوانیم. ڕاممووسی. لەمە بەدواوە چ قسەیەکمان نەکرد. بەخۆوەم فرساندو پەلەمان بوو کە خێرا پاسێك پەیدا بکەین وبرۆینەوە بۆ ماڵەکەی من وخۆ بدەین بەسەر تەختە خەوەکەمدا. پە نجەرەی ژوورەکەم کردبووەوە وزۆرمان کەیف دەهات کە شەوی هاوینە لە بەدەنی دەداین.

ئەو بەیانییە ماری لە ماڵی منا مایەوەو پێم گووت کە فراڤین پێکڤە دەخۆین. چووم خوارەوە گۆشت بکرم. لە گەڕانەوەدا لە ژوورەکەی ڕیمۆنەوە دەنگی ژنێك هاتە گوێم. دوای تۆزێك سالامانۆی پیر کەوتە تانەو تەشەر لە سەگەکەی. گوێمان لە دەنگی پێلاّوو چنگە کرێی حەیوانەکە بەسەر پلە دارینەکانی نەردەوانەکەوە بوو و ئەوجا: (( چە پەڵ، بۆگەن! )) بە جووتە وەدەرکەوتن بۆ سەر جادەکە. سەربوری پیرەمێرەم بۆ ماری گێڕایەوەو پێکەنی. بیجامەیەکی منی لەبەر کردبوو وقۆڵەکانی هەڵکردبوو. کە پێکەنی دیسان ئارەزووم چووە سەری. دوای تۆزێك لێی پرسیم کە ئایا خۆشم دەوێ؟وەڵامم دایەوە کە ئەم قسەیە مانای نییە. بەڵام وا خەیاڵ دەکەم کە نە. خەمبار بوو. بەڵام بەدەم فراڤین چێکرنەوە، لە خۆڕا جارێکی دی پێکەنی وماچم کرد. ڕێك لەم کاتەدا بوو کە هەراو زەنای قەرقەشەیەك لە ژوورەکەی ریمۆنەوە بەرز بووەوە.

هەوەڵجار گوێم لە دەنگی تیژی ژنێك بوو و پاشان دەنگی ریمۆن کە دەیگووت: (( تۆ فریوت داوم، منت فریو داوە، دەمەوێت تێت بگەیەنم کە فریوت داوم. )) دەنگێکی کپ هات و ژنە لە نەعرەتەی دا، هاوارێکی هێندە ترسناکی کرد کە لە پڕ ڕاڕەووەکە پڕ بوو لە خەڵکی. ماری و منیش چووینە دەرەوە. ژنە هەر هاواری دەکردو ریمۆن هەر لێی دەدا. ماری گووتی کارێکی هۆڤیانەیە. ومن هیچم نەگووت. داوای لێکردم کە بچم پۆلیس بانگ بکەم، گووتم حەز لەچارەی پۆلیسان ناکەم. بەهەرحاڵ پۆلیسێك لە گەڵ کرێنشینێکی قاتی دووەمدا کە بۆریچییە هات. پۆلیسەکە لە دەرگای داو ئیدی هیچ دەنگێك نەما. توندتر لە دەرگای داو دوای تۆزێك دەنگی گریانی ژنە بەرزبووەوەو ریمۆن دەرگای کردەوە. جگەرەیەکی بەدەمەوە بوو وهێدی وهێمن دەینواند. ژنە بە غار هاتە بەردەرگاو بە پۆلیسەکەی گووت کە ریمۆن لێی داوە. پۆلیسەکە گووتی: (( ناوت )). ریمۆن وەڵامی دایەوە. پۆلیسەکە گووتی: (( کە قسە دەگەڵ من دەکەی جگەرەکەت لەزار دەربێنە. )) ریمۆن دوودڵ بوو . نیگایەکی منی کردو مژێکی لە جگەرەکەی دا. لەم کاتەدا پۆلیسەکە تا هێز لە دەستیا بوو توقاتێکی خێواندە روومەتی. جگەرەکەی چەند مەترێك پەڕی. سیمای ریمۆن گۆڕا، بەڵام ئەو ساتە هیچی نەگووت. ئەوجا بەدەنگێکی خاکیانە پرسی ئایا دەتوانێ جگەرەکەی هەڵگرێتەوە؟ پۆلیسەکە گووتی دەتوانێ، ولەسەری ڕۆیی: (( بەڵام بۆ جارێکی دیکە فێربووی کە گاڵتە بە پۆلیس نەکەی. ))بەدرێژایی هەموو ئەم کاتە کیژێ هەر دەگریاو لێکدا لێکدا دووبارەی دەکردەوە: (( لێی دام .گەوادە. )) هەنگێ ریمۆن گووتی: (( جەنابی پۆلیس، ئایا قانون ڕێ دەدا کە بە پیاوێك بگووترێ: گەواد؟ ))بەڵام پۆلیسەکە ئەمری کرد: (( بێدەنگ. ))ئەوسا ریمۆن رووی کردە کیژێ و گووتی: (( کیژی باش، پەلە مەکە، چاو بەچاو دەکەوێتەوە. )) پۆلیسەکە پێی گووت کە زاری لێکبنێ، وگووتی کیژێ با

بڕوات و ئەو لە ژوورەوە چاوەڕوان بێ تا لەلایەن پۆلیسخانەوە بانگ دەکرێ. وئەوجا لەسەری ڕۆیی کە ڕیمۆن دەبێ شەرم لە خۆی بکات لەوەی ئەوەندە مەستە کە بەمجۆرە دەلەرزێ. ڕیمۆن گووتی: ((من مەست نیم جەنابی پۆلیس، بە دەستی خۆم نییە کە لە حوزوری تۆدا دەلەرزم.))ڕیمۆن دەرگای ژوورەکەی داخست و خەڵکەکە بڵاوەیان لێکرد، ماری ومن دیسان خەریکی ئامادەکردنی فراڤینەکەمان بووینەوە، لێ ئەو برسی نەبوو، من زۆربەی خواردنەکەم خوارد. ئەو سەعات یەك ڕۆیی و من کەمێك خەوتم.

نزیکی سەعات سێ لە دەرگای ژوورەکەیان دام و ڕیمۆن وەژوور کەوت. من لەسەر جێگەکەم ڕاکشابووم. ئەو لە قەراخ تەختە خەوەکەم دانیشت. ماوەیەك بێدەنگ بوو، من لێم پرسی کە کارەکەی گەییە کوێ. بۆی ڕونکردمەوە کە ئەوەی ویستوویەتی کردوویەتی. ژنەکە توقاتێکی لێدابوو وریمۆنیش لێی دابووەوە. ئەو دوایەکەشی بەخۆم دیتبووم. گووتم لەوە دەچێ ئێستا ژنە بەتەواوەتی بەسزای خۆی گەیی بێ و پێویستە ئەم خۆشحاڵ بێ. بەخۆیشی هەمان ڕای هەبوو. وگووتی پۆلیسەکە کارێکی بێهودەی کردووە. هەرچییەك بکات تۆڵەی دارکاری کردنی ژنەکە ناکاتەوە. ئەوجا گووتی ئەو پۆلیسان باش دەناسێت و دەزانێ دەبێ چۆن مامەڵەیان لە گەڵدا بکرێت. ئەوسا پرسی ئایا من چاوەڕێی ئەوە بووم کە وەڵامی توقاتی پۆلیسەکە بداتەوە؟ گووتم بە هیچ جۆرێ چاوەڕوان نەبووم، ولەوەش بترازێ من حەز لەچارەی پۆلیسان ناکەم. ڕیمۆن زۆر خۆشحاڵ بوو. پرسی ئایا ئارەزووم لێیە لە گەڵیا بچمە دەرێ؟ هەستام و کەوتمە شانەکردنی قژم. هەنگێ پێی گووتم دەبێ ببمە شایەتی. بۆ من هیچ فەرقێکی نەدەکرد، بەلام نەمدەزانی دەبێ چ بڵێم. بە قەناعەتی ڕیمۆن ئەوەندە بەس بوو شایەتی ئەوەی بۆ بدەم کە کیژێ فریوی داوە. ئیدی قاییل بووم کە ببمە شایەتی.

چووینە دەرێ وریمۆن عارەقێکی نایابی دەرخوارد دام، ئەوجا ئارەزووی دەستێك بلیاردی کرد ومن بەچەند خاڵێکی کەم دۆڕاندم. ئەوجا هەوەسی قەحپەخانەی کەوتە سەر ،بەلام پێم گووت نا، چونکە ئەهلی ئەو شوێنە نیم. هەنگێ لۆش لۆش گەڕاینەوەو گووتی چەند خۆشحاڵە کە توانیویەتی ماشوقەکەی تەمبێ بکات. سەیرم کرد زۆر لەگەڵ منا میرەبان و بە ئەدەبە، هەستم کرد وەختەکە بە خۆشی ڕۆیی.

لەدوورەوە، لە ئاستانەی دەرگاکەدا سالامانۆی پیرم بینی کە سیمای پەشێو و پەریشان بوو. کە نزیك بووینەوە بینیم سەگەکەی لە گەڵا نییە. بە هەر چوار نکالا هەڵیدەڕوانی، بەدەوری خۆیا دەسوڕایەوە، هەوڵیدەدا تاریکی داڵانەکە بڕێ. لەبن لێوانەوە پرتەو بۆڵەی دەکرد و دووبارە بە چاوە بچووك و سورەکانی کۆڵانەکەی بەرنیگا دەدا. کاتێ ڕیمۆن لێی پرسی چییەتی، یەکسەر وەلامی نەدایەوە. بەحاڵ گوێم لێ بوو کە لەبن لێوانەوە دەیگووت: ((چە پەڵ، بۆگەن.))و بێ ئۆقرە دەجولا. لێم پرسی سەگەکەی لە کوێیە. زۆر بەوشکی وەلامی دایەوە کە ڕۆییوە. ئەوسا لە پڕو بەلەز کەوتە قسان: (( وەکو جاران بردم بۆ مەیدانی مەشق، ئاپورایەکی زۆر لە دەوروبەری بازاڕی دەسگێڕەکان خڕبووبوونەوە. وەستام تا تەمەشای نمایشی ((پاشای هەلاتوو)) بکەم. وەختێ ویستم بگەڕێمەوە، بۆخۆی ڕۆیی بوو. هەڵبەتە دەمێ بوو پێوە بووم کە قرێتەیەکی تەنگتری بۆ بکڕم. بەلام قەت بەبیرما نەدەهات کە ئەم بۆگەنە بەمجۆرە لەدەستم بڕوات.))

ئەوسا ڕیمۆن بۆی باس کرد کە ڕەنگە سەگەکەی گوم بووبێ و دەگەڕێتەوە. نموونەی ئەو سەگانی بۆ هێنایەوە کە دەیان کیلۆمەتر دوور کەوتبوونەوەو پاشان بۆ لای خاوەنەکانیان گەڕابوونەوە. وێڕای ئەمەش

پیرەمێر پەرێشانتر بوو.(( لێمی دەبەن، حاڵی هەی. کاشکێ کەسێك بیگرێ. بەڵام ئەمە مەحاڵە. خەڵکی قێزیان لە گەڕییەکەی دەبێتەوە. هەڵبەتە پۆلیس دەیگرن.)) ئیدی پێم گووت کە سەردانی گەوری حەیواناتی گوم بوو بکات وسەگەکەی بە بڕە پارەیەك دەدەنەوە. لێی پرسیم پارەکەی زۆرە؟ بەڕاستی نەمدەزانی. ئەوسا توڕە بوو: (( پارە لەم بۆگەنە خەرج بکەم؟ با بڕوا بتۆپێ! ))و دەستی کرد بەجنێودان. ریمۆن پێکەنی و وەژوورکەوت. منیش بەدوویدا وەژوورکەوتم ولە ڕاڕەوەکەدا لێکدی جیا بووینەوە. دوای تۆزێك گوێم لەدەنگی پێی پیرەمێردەکە بوو کە لە دەرکەی دام. کە دەرکەم کردەوە، تۆزێك لەبەر دەرکە وەستاو گوتی: (( ببورە، ببورە )) خوڵکم کرد بێتە ژوورەوە، بەڵام نەهات. چاوانی بڕییوونە نووکی پێڵاوەکانی و دەستە بەڵەکەکانی دەلەرزین. بێ ئەوەی رووم تێبکات لێی پرسیم: (( پێم بڵێ ئاغای مەرسۆ کەسێك سەگەکەم لێ نادزێ؟ ئایا بۆمی دەگێڕنەوە؟ تەگبیری من چییە؟ )) پێم گووت لە گەوری حەیواناتی گووم بوودا سێ رۆژان گلی دەدەنەوە تا خاوەنەکەی بچێ بەسۆراخییەوە. پاشان چۆنیان ئارەزوو لێ بێ وایان لەگەڵدا دەکەن. بەماتی نیگای کردم. پاشان گووتی: (( شەو باش. )) دەرکەی ژوورەکەی پێوەداو گوێم لە دەنگی هاتو چۆی دەبوو. جیڕەجیڕێك لە تەختە خەوەکەیەوە هات. بەو دەنگە هێواشەی لە تیغە دیواری نێوان دوو ژوورەکەوە دەهات، زانیم کە دەگری. نازانم بۆچی دایکم بیرکەوتەوە. دەبوایە سبەینێ زوو لە خەو ڕابم. برسیم نەبوو و بەبێ شێو لێی نووستم.

((٥))

ریمۆن تەلەفۆنی بۆ کردم بۆ دایەرە. گووتی یەکێك لە هاورێکانی (سەبارەت بە من قسەی لەگەڵ کردبوو) رۆژی یەك شەممە دەعوەتم بۆ کابینە هاوینەکەی خۆی لە نزیکی جەزایر. وەڵامم دایەوە کە زۆرم پێخۆشە، بەڵام بەڵێنم بە کیژە دۆستەکەم داوە کە یەك شەممەلەگەڵ ئەودا بەرمە سەر. ریمۆن یەکسەر وەڵامی دایەوە کە ئەویش دەعوەت دەکات. ژنی برادەرەکەی زۆر خۆشحاڵ دەبێ کە بەتەنیا لە نێو دەستەیەك پیاودا نابێ.

ویستم یەکسەر تەلەفۆنەکە دابنەمەوە. چونکە دەمزانی بەرێوەبەرەکەم بەوە قەڵس دەبێ کە لەشارەوە تەلەفۆن بۆ ئێمە بکرێ. لێ ریمۆن تکای کرد کە تۆزێك سەبر بکەم و گووتی دەیتوانی ئێوارێ ئەم دەعوەتەم پێ ڕابگەیەنێ، بەڵام ویستویەتی لە شتێکی دیکەش ئاگادارم بکات. تاقمە عارەبێك کە برای کۆنە ماشقەکەشی لە گەڵیانا بووە، بە درێژایی رۆژ تاقیبیان کردبوو(( ئەگەر ئەمشەو لە کاتی گەڕانەوەدا ئەوت لەبەر ماڵەوە بینی، ئاگادارم بکەوە. ))وەڵامم دایەوە زۆر چاکە.

دوای تۆزێك بەرێوەبەر گازی کردم ولە پڕ پەست بووم چونکە بەخەیاڵی خۆم دەیویست پێم بڵێ کەمتر تەلەفۆن بکەم و باشتر کار بکەم. بەڵام شتی وا نەبوو. گووتی دەیەوێ دەربارەی پرۆژەیەك قسەم لەگەڵ بکات کە هێشتا بەتەواوەتی نەبڕاوەتەوە. دەیویست ڕای من دەربارەی پرۆژەکە بزانێ. گووتی نیازی وایە نووسینگەیەك لە پاریس بکاتەوە، بۆ ئەوەی هەر لەوێندەرو راستەوخۆ بە کارەکانی ڕا لەگەڵ کۆمپانیا گەورەکانا بگات. ودەیویست بزانێ کە ئایا ئامادەم بۆ ئەوێندەر بڕۆم؟ جا لەم حاڵەدا دەکرا لە پاریس بژیم و هەندێ بەشی ساڵ بە سەفەر بگوزەرێنم.(( تۆ گە نجیت و پێم وایە دەبێ ئەم ژیانەت بەلاوە خۆش بێ )) گووتم بەڵێ، بەڵام لەڕاستیدا بۆ من هیچ فەرقێ ناکات. لێی پرسیم ئایا بەلامەوە گرینگ نییە کە

**گۆڕانێك لە ژیانما چیٚ ببیٚ؟ وەلاٚم دایەوە کە لە ژیانـا چ گۆڕانێـك روونـادات،وژیانـەکان هـەموو چـونیەکن وژیانی من لێرەدا بەشێوەیەکی گشتی ناخۆش نییە. ئەو پەست بوو. پێی گووتم کە هەمیشە وەلاٚمی لابـەلا دەدەمەوە، تەماح و بەرزەفڕیم نییە وئەمە لەجیهانی کارو کاسبیدا مایەی تێشکانە. هەنگیٚ گەڕامەوە سەر کارەکەم. واچاکتر بوو کە پەستی نەکەم، بەلاٚم هیچ هۆیەك نەبوو بۆ وەی ژیانم بگۆڕم. کاتیٚ کە بـاش لـە وەزع وحاڵی خۆم ورد دەبوومەوە، دەمبینی کە کلۆڵ نیم. کاتیٚ کە خوێنکاری زانکۆ بـووم لـەم بەرزەفڕیانـەم زۆر بوو. بەلاٚم کاتیٚ کە ناچار بووم خوێندن تەرك بکەم، زۆر زوو پەیم بەمـە بـرد کـە هـەموو ئـەم شـتانە پوچ وبێهودەن.**

**شەویٚ، ماری هات بۆ لام و لێی پرسیم ئایا ئامادەم زەماوەندی لە گەڵ بکەم! وەلامم دایـەوە کـە بـۆ مـن هیچ فەرقیٚ ناکات و ئەگەر ئەو مەبەستییەتی ئەوا دەتوانین ئەم کارە بکەین. ئەوسا ویستی بزانیٚ کە ئایا خۆشم گەرەکە. وەکو کەڕەی پێشوو وەلاٚمم دایەوە کە ئەم قسەیە چ مانایەکی نییە، بـەلاٚم بێگومـان خۆشـم گەرەك نییە، گووتی: ((کەواتە بۆچی زەماوەنـدم لەگـەڵ دەکـەی؟)) بـۆم روونکـردەوە کـە ئـەم کـارە هـیچ بـایەخێکی نییەو ئەگەر حەزی لیٚ بیٚ ئەوا دەتواتین زەماوەند بکـەین.. ئەلهـەقی ئـەو خوازیـاری زەماوەنـد بوو ومن هەر بەڵێم لەسەر بوو. هـەنگیٚ دوو پـاتی کـردەوە کـە زەماوەنـد کـارێکی گرنگـە. وەلاٚمـم دایـەوە: ((نە.)) تۆزێك مات بوو وبەبێدەنگی نیگای کردم. ئەوسا پرسی ئایا هەمان پێشنیازم لە ژنێکی دیکە، کـە بەهەمان شێوە دڵم بەوەوە بوو قەبوڵ دەکرد؟ گووتم: (( هەڵبەتە.))هەنگیٚ مـاری گـووتی هێشـتا دوودڵـە لەوەی کە منی خـۆش گەرەکـە یـان نـا. هەڵبەتـە مـن هیچم لەمبارەیـەوە نـەدەزانی. ئەوسـا دوای کـەمێك بێدەنگی، لە بن لێوانەوە گووتی کە من بنیادەمێکی غەریبم. وبێگومان هەر لەبەر ئەمەیـە کـە منـی خـۆش گەرەکە. لیٚ رەنگە لەبەر هەمان هۆ رۆژێك لە رۆژان لە من بێزار ببیٚ. چونکە هیچم پیٚ نەبوو بیڵێم بێدەنگ بووم، بەدەم بزەوە باسکی گرتم و گوتی دەخوازیٚ زەماوەندم لە گەڵ بکات. وەلاٚمم دایەوە هەر کاتیٚ مـەیلی لیٚ بیٚ ئەم کارە دەکەین. ئەوسا باسی پێشنیازی بەرێوەبەرەکەم بۆ کرد و ماری پێی گووتم زۆری حـەز لێیـە پاریس بـدینیٚ. گـووتم ماوەیـەك لەوێنـدەر ژیـاوم و پرسـیاری چـۆنییەتی ئەوێنـدەری لیٚ کـردم. گـووتم: ((شوێنێکی پیسە ، پڕە لە کۆترو حەسارانی تەنگ و تـاریك، خەڵکەکەی سپی پێستن.))**

**ئەوجا چووینە پیاسەو بەشەقامە گەورەکانی شاردا تێپەڕین.هـەموو ژنـەکان جـوان بـوون. لـە مـاری )م پرسی کە هەست بەمە دەکات. بۆ ساتێك هیچ قسەیەکمان نەگرد. لەگەڵ ئەمەشا حـەزم دەکـرد لـە لای مـن بمێنێتەوەو گووتم دەتوانین لە رستۆرانەکەی سیلست دا پێکڤە شێو بخۆین. زۆری حـەز دەکـرد بـەلاٚم کـاری هەبوو. لە نزیکی ماڵەوە خوا حافیزیم لێکرد. نیگایەکی کـردم ((نـاتـەویٚ بزانـی کـە چ کـارێکم هەیـە؟)) هەڵبەتە دەمویست بزانـم، بەلاٚم بیرم لیٚ نەکردبووەوە. بۆیـە وای نوانـد کـە سەرزەنشـتم دەکـات. کـە بـەو شڵەژاوییە بینیمی دیسان پێکەنی و هەموو بەدەنی لیٚ هێنـامە پێشەوە تـا ڕامووسانێکم بداتیٚ.**

**لە خوارنگەکەی سیلست شێوم خوارد. ماوەیـەك بـوو دەسـتم بـەنـان خـواردن کردبـوو کـە ژنێکـی زیتـەڵی غەریب وەژوور کەوت. لێی پرسیم کە ئایـا دەتـوانیٚ لەسـەر مێزەکـەی مـن دانیشـێت؟ هەڵبەتـە دەیتـوانی. رەفتارو ئەتواری خێراو پچڕ پچڕ بوو، جووتێـك چـاوی پڕشـنگدا بەسیمای وردیلـەی سێو ئـاسـایەوە بـوو. چاکەتەکەی داکەند. دانیشت و بەگەرمی کەوتە نۆڕینی لیستی خواردنەکان. سیلسـتی گـاز کـردو یەکسـەرو بە دەنگێکی روون و خێراو پچڕپچڕ هەموو خواردنـەکانی خـۆی داواکـرد. بـەدەم چـاوەڕوانی بەرخواردنـەوە**

جانتاكەی كردەوە. كاغەزێكی چوارگۆشەو قەڵـەمێكی ڕەشـی دەرهێنـا و پێشـوەختە حیسـابی خواردنەكـەی كردو نرخی تەواوی خواردنەكەی بەسێرفزەوە لـە گیرفانـە چكۆلەكەی خـۆی دەرهێنـا ولەبـەردەمی خۆیـدا دایـنـا. لـەم كاتـەدا بەرخواردنەكـەیان هێنـاو بە پەلـە هەڵیقوڕانـد. بـەدەم چـاوەڕوانی خواردنەكەیـەوە، هەمدیس قەڵـەمێكی ڕەساسـی شـینی لەگـەڵ گۆڤـارێكی هەفتانـەی بـەرنامانی رادیـۆیی دا لـە جانتاكـەی دەرهێنا. زۆر بەوردی كاتی هەموو بەرنامەكانی خوێندەوەو ئیشارەتی لێدان. چـونكە گۆڤارەكـە دە دوانـزە لاپەرەیەك دەبوو، ئەم كارەی زۆر بەوردی بەدرێـژایی كـاتی نا نخواردنەكـە درێـژە پێـدا. مـن خواردنەكـەم تەواو كردبوو كە ئەو هێشتا بەهەمان گـەرم و گـوڕی مـژولی خوێندنـەوەی گۆڤارەكـە بـوو. ئـەوجا هەسـتا. ئامێر ئاسا چاكەتەكەی لەبەر كردو ڕۆیی، منیش كـە هـیچ كـارێكم نـەبوو، وەدەركـەوتم و ماوەیـەك دوای كەوتم. ملی شۆستەكەی گرتبوو و بەدڵنیاییەكی باوەڕنـەكراوەوە بـێ هـیچ لادان و ئـاوڕدانەوەیـەك بـەڕێی خۆیدا دەرۆیی. ئاقیبەت لەچاوم ونبوو وبەڕێی خۆمدا گەڕامـەوە، پـێم ژنێكـی غـەریب بـوو. بـەلاّم زۆر زوو لەبیرم چووەوە.

لەبەر ماڵەوە تووشی سالامانۆی پیر بووم. بردمە ژوورەوەو پێی راگەیاندم كەتەواو، سەگەكەی ونبووە، چونكە لەبنكەی حەیواناتی گووم بـوودا نەیدۆزیوەتـەوە. كارمەنـدانی ئەوێنـدەر پێیـان راگەیانـدبوو كـە ڕەنگە كەوتبێتە ژێر ئۆتۆمۆبیلەوە. پرسی بووی كە ئایـا دەتـوانێ لـە پۆلیسـخانەكاندا سـۆراخێكی دەسـت بكەوێ. وەلاّمیان دابووەوە كە ئەم ڕووداوانە ناهێڵنەوە چونكە ڕۆژانـە ئـەم شـتانە زوو دەدەن. بەسـالامانۆم گووت دەتوانێ سەگێكی دیكە پەیدا بكات، وگووتی ئاخر هۆگری ئەمە بوو بوو، ڕاستیشی دەكرد.

لەسـەر تەختـە خەوەكـەم بەچیچكانەوە ڕۆنیشـتبووم و سـالامانۆ لەسـەر كورسـییەكی كـەنار مێزەكـە دایشتبوو. ڕێك بەرانبەر بەمن بـوو ودەسـتەكانی نابوونـە سـەر زرانییـەكانی. كۆنـە كلاّوە لبادەكـەی هـەر لەسەر بوو. لەبن سمێڵە زەردەكەیەوە منگە منگی دەكرد. كەمێك پێـی بێتاقـەت بـووم. بـەلاّم هـیچ كـارێكم نەبوو وخەویشم نەدەهات. هەر بۆ ئەوەی قسەیەك بكەم سەبارەت بە سەگەكەی هەندێ پرسیارم لێی كرد. گـووتی لـەمردنی ژنەكـەی بـە دواوە تـا نهـۆ ئـەم سـەگەی هـەبووە، زۆر درەنـگ ژنـی هێنـابوو. لەلاویـدا كەڵكەڵەی شانۆكاری لەسەردا بووە، لەماوەی خزمەتی سەربازیدا لە شانۆییە سوپاییەكاندا یـاری دەكـرد، بـەلاّم لـە ئـە نجاما لـەكاری ڕێگـەی ئاسـندا گیرسـابووەوە و لێـی پەشـیمان نییـە. چـونكە نهـۆ سـووكە خانەنشینییەك وەردەگرێ. لەگەڵ ژنەكەیدا بەختەوەر نەبووە، بەلاّم بەشێوەیەكی گشـتی هـۆگری بـوو بـوو كـە ژنەكـەی مـردووە زۆری هەسـت بـە تـەنیایی و بیكەسـی كـردووە. ئیـدی داوای سـەگێك لـە یـەكێك لـە هاوكارەكانی دەكات و ئەم سەگەی، كە ئەوسا تووتەڵە بووە، دەداتێ. دەبوایـە بەمەمكەمـژە شـیری بـداتێ، بەلاّم چونكە سەگ تەمەنی لە بنیادەم كورتترە، پێكڤە پیر بووبوون.

سالامانۆ گووتی: (( تەبیعەت شەڕانی بوو. هەندێ جار لێمان دەبـوو بەشـەڕ، بـەلاّم بەگشـتی سـەگێكی باش بوو. )) گووتم: (( ڕەسەن بوو )) وسالامانۆ كەیفی هات. و لەسەری ڕۆیی: (( تۆ بەر لەنەخۆشـییەكەی نەت دیبوو. كوڵكەیەكی بێ ئەنازە جوانی هەبوو. )) لەوساوە كە ئـەم سـەگە تووشـی نەخۆشـی پێسـت بـوو بوو، سالامانۆ هـەموو ئێـوارەو بەیانییـەك چـەوری دەكـرد. بـەلاّم بـەباوەڕی ئـەو، نەخۆشـی راسـتەقینەی سەگەكە پیری بوو و پیری چارەسەری نییە.

لەم کاتەدا باوێشکێکم داو پیرەمێردەکە گووتی ئیدی دەبێ بڕوات. پێم گووت پەلەی چییە، بۆی هەیە دانیشێت. وگووتم پێم ناخۆشە کە سەگەکەی وای لێهاتووە. سوپاسی کردم. گووتی کە دایکم سەگەکەی ئەوی زۆر خۆشدەویست. کە دەهاتە سەر باسی دایکم دەیگووت(( دایکە بەسەزوانەکەت)). وای خەیاڵ دەکرد کە لەوەتای دایکم مردووە دەبێ من زۆر غەمگین بم. ومن هیچ وەلامێکم نەدایەوە ئەوجا بە پەلەو بەدەنگێکی شەرمنانە گووتی دەزانێ کە خەڵکی گەڕەك لەسەر ئەوەی کە دایکم لە کەترەخانە دانابوو، لۆمەیان کردووم. بەلام ئەو من دەناسێت و دەزانێ کە دایکم خۆشدەویست. ئێستاش نازانم بۆچی وەلامم دایەوە کە تا نهۆ نەمزانیوە کە خەڵکی لەسەر ئەم شتە لە پاش ملەم دەڵێن. خۆ کەترەخانە بەلای منەوە کارێکی ئاسایی بوو. چونکە پارەی پێویستم نەبوو خزمەتی دایکمی پێ بکەم. لەسەری رۆییشتم کە(( دەمێك بوو چ قسەیەکی پێ نەمابوو لەگەڵمی بکات و بەتەنیا بێتاقەت دەبوو.)) گووتی: (( لەکەترەخانەدا بنیادەم بەلای کەمەوە بۆخۆی هاوڕێ پەیدا دەکات.))ئەوسا عوزرخوایی کرد. دەیویست بڕوات بخەوێ. نهۆ ژیانی گۆڕابوو ونەیدەزانی دەیەوێ چ بکات. لەوەتای دەمناسی بۆ یەکە مجار بوو کە بە پەشۆکاوی و شەرمەوە دەستی بۆ هێنام و هەستم بە چرچ ولۆچی پێستی دەستی کرد. کەمێك پێکەنی و بەرلەڕۆییشتن گووتی: (( خۆزیا ئەمشەو کسۆکان نەدەوەڕین، هەمیشە واهەست دەکەم کە دەنگی سەگەکەی خۆمە.))

((٦))

یەك شەممە بەزەحمەت لە خەو ڕابووم. دەبوایە ماری گازم بکات و ڕامبتەکێنێ. هیچمان نەخوارد. چونکە دەمانویست زوو فریای مەلە بکەوین. هەستم کرد تەواو داهێزراوم و کەمێك سەرم دەیەشا. جگەرە لە دەمما تاڵ بوو. ماری گاڵتەی پێدەکردم و دەیگووت: ((لە تازیەبار)) دەچم. جلێکی کەتانی سپی لەبەر کردبوو وقژەکەی بەردابووەوە. پێم گووت کە جوان بووە. لەخۆشیا پێکەنی.

کە دەهاتینە خوارێ لە دەرکەی ژوورەکەی ریمۆن-مان دا! وەلامی داینەوە کەوادێ. بەهۆی ماندوویەتیم و چونکە پەنجەرەکانم نەکردبووەوە، تیشکی تیژی هەتاوەکە وەکو توقاتێك بەر دەموچاوم کەوت. ماری لەخۆشیا هەر هەڵدەبەزییەوە و لێکدا لێکدا دەیگووت چ رۆژێکی خۆشە. ئەوجا حاڵم باشتر بوو و هەستم دەکرد برسیمە. ئەمەم بەماری گووت و ئەویش جانتا موشەممایەکەی خۆی نیشانم دا کە مایۆکانمان و خاولییەکی تیا دانابوو. هیچ چارێکم نەبوو تەنیا سەبر نەبێ. و گوێمان لێ بوو کە ریمۆن دەرکەی ژوورەکەی داخست. پانتۆلێکی شین و کراسێکی سپی قۆڵ کورتی لەبەر کردبوو. کلاوێکی حەسیری لەسەر بوو، کە ماری خستە پێکەنین. باسکەکانی کە لەژێر مووی ڕەشا سپی دەچووەوە، کەمێك دڵی تێکدەدام. بەدەم دابەزینەوە فیکەی دەکێشاو شادو خۆشحاڵ دەهاتە بەرچاو. پێی گووتم: (( سلاو هاوڕێ)) وبە ((خانم)) ماری دواند.

دوێنێ ئێوارە چووبووینە پۆلیسخانەو من شایەتیم دابوو کە ئەو کیژە، ریمۆنی فریو داوە. ومەسەلەکە بە ئاگادارکردنەوەیەکی سادە بۆ ریمۆن بڕابووەوە. بەتانی قسەکانی منیشدا نەچوون. لەبەر دەرگا باسی ئەمەم لەگەڵ ریمۆن دا کرد وپاشان بڕیارمان دا بە پاس بڕۆین. کەنارەکە زۆر دوور نەبوو. بەلام بە پاس زۆر زووتر دەگەییشتین. ریمۆن پێی وابوو کە هاوڕێکەی خۆشحاڵ دەبێ بەوەی کە زوو دەگەین. خەریك بوو

بەڕێ بکەوین کە ریمۆن لەناکاو ئاماژەی بۆ کردم کە بڕوا نمە بەرانبەر. دەستە عارەبێکم بینی کـە شـانیان بە دوکانی جگەرەفرۆشێکەوە دابوو. بەبێدەنگی، بەلاّم بەشێوەی خۆیان چاویان بڕی بووە ئێمە. رێـك وەکـو ئەوەی ئێمە بەرد بین یان دارو درەختانی بێگیان. ریمۆن پێی گووتم کە دووەمیان لەدەستە چـە پەوە یـارۆی ڕەقیبی ئەوەو نارەحەت بوو. لەگەڵ ئەوەشا ریمۆن گووتی کە ئەم چیرۆکە تازە بڕاوەتـەوە. مـاری بەباشـی سەری لەقسەکا نمان دەرنـەدەکرد و پرسـی مەسەلەچییە. گـووتم ئەمانـە عـارەبن و سـووکە کێشـەیەکیان لەگەڵ ریمۆن دا هەیە. ماری ویستی یەکسەر بڕۆین. ریمـۆن خـۆی راسـت کـردەوەو بـە پێکەنینـەوە گـووتی پێویستە پەلە بکەین.

بـەرەو وێسـتگەی پاسـەکە، کـە زۆر دوور نـەبوو وەرێکـەوتین. ریمـۆن پێـی راگەیانـدم کـە عارەبـەکان تـاقیبمان ناکەن. من ئاوڕی پاشەوم دایەوە، ئەوان بەهەمان شێوە لەجێی خۆیان وەستابوون وبەهەمان بـێ موبالاتی و خەمساردی دەیانڕوانییە ئەو شـوێنەی کـە ئێمـە تـازە جێمـان هێشـتبوو. سـواری پـاس بـووین. ریمۆن کە تەواو ئاسودە دەهاتە بەرچاو، بەردەوام نوکتـەی بـۆ مـاری دەگـووت وسـوعبەتی لەگـەڵ دەکـرد. هەسـتم کـرد کـە بـەماری خۆشـحاڵە، بـەلاّم مـاری تەقرییـەن هـیچ وەلاّمێکـی نەدەدایـەوە. جـار جارێـك بە پێکەنینەوە نیگایەکی دەکرد.

لەدەرەوەی شاری جەزایر دابەزین. کەنارەکـە زۆر لـە ویسـتگەی پاسـەکەوە دوور نـەبوو. بـەلاّم دەبوایـە بەسەر گردێکی بچکۆلەدا کە دەیڕوانییە سەر دەریـا وبـەرەو پلاژەکـە نشـێو دەبـووەوە، تێبپـەڕین. گردەکـە بەزەردە تـاوێران و گوڵە کێویلەی سپی ژێر ئاسمانی شینی تۆخ دا پۆشرابوو. مـاری جانتـا مشـەماکەی خـۆی بەگوڵەکانا دەداو هەڵیدەوەراندن وبەم شێوەیە خۆی سەرگەرم دەکرد. بەناو ریزی خانووە چکۆلەکانا، کـە بە پەرژینی کەسك یان سپی دەورە درابوون، رەتبـووین، هەنـدێکیان بـە هەیوانـە سەرتاسـەرییەکانیانەوە لەژێر دار گەزاندا وون بووبوون. وهەندێکیان کەوتبوونە ناو تـاوێرە رووتەنەکانـەوە. بەرلـەوەی بگەینـە قەراخی گردەکە، دەریای هێدی وئارام، وکەمێ لـەولاترەوە لووتەیـەکی خـەواڵوی نـاو ئـاوە زولاڵەکـەمان بینی. دەنگی هێمنی ماتۆڕێك لە نێو هـەوا کپەکـەوە هەسـتا، و گەییـە ئێمـە.لـەدووری دوورەوە بەلـەمێکی چکۆلەی ماتۆڕدارمان بینی کە لەدەریا ساف و زولاڵەکـەدا بەشێوەیەکی هەست پێنـەکراو دەچـووە پێشـێ. ماری چەند گوڵە زەمەقێکی کێوی چنی. کە لەو سەرەولێژییەی بـۆ دەریاکـە دەچـوو نشـێو بووینـەوە لەسـەر کەنارەکە چەند کەسێکمان بینی کە بۆ مەلە هاتبوون.

هاوڕێکەی ریمۆن لە کابینەیەکی دارینی چکۆلەی ئەوسەری کەنارەکە دەژیا.کابینەکە پشتی بە کۆمەڵە تاوێرێکەوە بوو، وئـەو پایـە ئاسـنانەی کـە پێشـەکەیان راگرتبوولـە ئاوەکـەدا بـوون. ریمـۆن بەیـەکتری ناساندین. هاوڕێکـەی ماسـۆنی نـاو بـوو. پیـاوێکی بالاّبـەرزو تۆکمـەو چـوار شـانە بـوو. ژنەکـەی کورتـە بالاّیەکی خە پەتۆڵەی میهرەبانی پاریسی زمـان بـوو. ماسـۆن یەکسـەر پێـی گـووتین کـە ئیسـراحەتی خـۆ بکەین و بۆ نیوەڕۆ ماسـی سـورەوەکراویان هەیـە کـە ئـەو بەیانییـە لـە دەریاکـەدا گرتبـوونی. پـێم گـووت ماڵەکەی زۆر جوانە. گووتی کە رۆژانی شەممە و یەکشەممە وهەموو پشووەکان لێرە بەسەر دەبات. لەسەری رۆیی: ((من و ژنەکەم رێکین)). رێك لەم کاتـەدا ژنەکەی لەگەڵ ماری دا پێدەکەنی. بۆ یەکە مجار بەڕاستی بیرم کردەوە کە ژن بینم.

ماسۆن دەیویست مەلە بکات. بەلآم ژنەکەی وریمۆن دڵیـان پێـوە نـەبوو بـێن. بەسـێ قـۆڵی داگـەراین و ماری یەکسەر خۆی فرێدایە ئاوەکەوە. من و ماسۆن کەمێك سەبرمان کرد. بەکاوەخۆ دەپەیڤی و هەستم کـرد عادەتی وایە هەر رستەیەکی خۆی بە( دەتوانم بڵێم ) کۆتـایی دێنێ، تەنانەت ئەگەر ئەم دەستەواژەییە چ شتێك نەخاتە سەرمانای رستەکەی. سەبارەت بەماری گووتی: (( زیتەڵەیە، دەتوانم بڵێم جوانە. )) ئیـدی گوێم بەم عادەتەی ئەو نەدا، چونکە خەریك بوو هەستم دەکرد هەتاوەکەم لە گیان خۆشە. لمەکەی ژێر پێم خەریك بوو گەرم دەبوو. تۆزێکی دیکەش ئارەزووی مەلەکردنەکـەم دواخست. ئـە نجام بـە ماسـۆنم گـووت: (( بڕۆین؟ )) خۆم هەڵدایە ئاوەکەوە. ئەو هێدی هێدی بەناو ئاوەکە کەوت و کاتێ کە پێـی لـە عـاردی بـڕا خۆی هەڵدا. بۆقە مەلەی دەکرد. جا چەند ناشیانە، ئیدی پێشم دایەوە تا خـۆ بگەیە نمـە مـاری، ئاوەکـە سارد بوو، و مەلە کردنم پێ خۆش بوو، لەگـەڵ مـاری دا دوور کەوتینـەوەو لـە جوڵـەو شـادی دا هـەردووك هاوبەش بووین. لە ناوەندی دەریاکـەدا کەوتینـە سـەرگازی پشت و رووم لـە ئاسمـان بـوو، هەتاوەکـە دوا پەردەی ئەو ئاوەی لادەبـرد کـە بەسـەر زارمـا دەڕۆیـی. دیـتم ماسـۆن بـۆ کەنارەکـە دەگەڕێتـەوە تـا لەبـەر هەتاوەکەدا راکشێت. لە دوورەوە زەلام دەینواند. ماری ویستـی پێکڤـە مەلـە بکـەین. کەوتمـە دوایـەوە تـا دەست بخەمە ناو قەدی وئەو بە باسکە مەلە دەچووە پێشێ ومنیش بە پا مەلە یارمەتیم دەدا. شـڵپە شـڵپی ئارامی ئاوەکەمانم بە دوواوە بوو، هەستم کرد ماندوو بووم. ئیدی وازم لە ماری هێناو لـەکاتێکا بـە رێـك و پێکی مەلەم دەکـرد و بەدروسـتی هەناسـەم دەدا گەرامـەوە. لەسـەرکەنارەکە، بـەدەمـاو لـە پـاڵ ماسـۆندا راکشام و دەموچاوم خستە سەر لمەکە. پێم گووت: (( کە بەلەزەت بوو. )) وئـەویش هـەمان رای هـەبوو. دوای تۆزێك ماری هات. ئاورم دایەوە تا هاتنەکەی تەمەشا بکەم. ماری لە شۆراوکی ئاوەکەدا لینج و لیغیـز بـوو بوو. قژەکەی بە پشتا رژابوو. لە پاڵ منـا راکشـاو گـەرمی بـەدەنی ئـەو و هەتـاوەکـە، بەرەبـەرە خـەویان لێخستم.

دوای تۆزێك ماری تەکانی دام و گووتی ماسۆن بۆ ماڵ گەرایـەوە، دەبـێ فـراڤین بخـۆین. چـونکە برسـی بووم یەکسەر هەستام. لێ ماری پێی گووتم کە لـە بەیانییـەوە تـا ئیسـتا رام نەمووسیوە. راسـتی دەکـرد، منـیش حـەزم لێ بـوو. گـووتی: (( وەرە نـاو ئاوەکـە )) غـارمـان دا تـا خـۆ بخەینـە هـەمێزی هـەوەڵین وردە شە پۆلانەوە. تۆزێك مەلەمان کردو ئەو خۆی پێوە چەسپاندم. هەسـتم کـرد لاقـەکانی لـە لاقـم هالآنـد و هەوەسم چووە سەری..

کە دەگەرایینەوە، ماسۆن بـانگی دەکردین. گووتم کە زۆرم برسییە ویەکسەر بە ژنەکەی گووت کـە خۆشـی لێم دێ. نانێکی بە لەزەت بوو. مـن بەشـە ماسییەکەی خـۆم ماشـییەوە. ئـەوجا نـۆرەی گۆشـت و پەتاتـەی سورەوەکراو هات. هەموومان کڕ وکپ نا نمـان دەخـوارد. ماسـۆن پـەیتا پـەیتا شـەرابی دەخـواردەوەو لێکـدا لێکدا بۆ منیشی تێدەکرد. کە سەرە هاتە سەر قـاوە، سـەرم هەنـدێ قـورس بـوو وجگەرەیـەکی زۆرم کێشـا. ماسۆن وریمۆن و من هات بەبیرماندا کە مانگی ئاب پێکـەوە، بەشـەریکی، لـە کـەناری دەریاببەینـە سـەر. ماری لە پڕ گووتی: (( دەزانن سەعات چـەندە؟ سـەعات یـانزەو نیـوە. ))هـەموومان سەرمانسـوڕما. ماسـۆن گووتی زۆر زوو نا نمان خوارد. و شتێکی ئاساییە پیاو هـەرکاتێ برسـی بـێ، وەختـی نا نخواردنـە. نـازانم ماری بۆچی بەم قسەیە پێکەنینی هات. وابزانم کەمێك زیادی خواردبـووەوە. هـەنگێ ماسۆن لێـی پرسـیم ئایا حەزم لێیە پیاسەیەکی کەنارەکەی لە گەلا بکەم. (( ژنەکەم هەمیشە دوای فراڤین دەخەوێ، بەلآم مـن

حەزم لێ نییە. دەبێ ڕێیکەم. هەمیشە پێی دەڵێم کە ئەم ڕێکردنە بۆ سەلامەتی باشە. بە هەرحاڵ، مەیل مەیلی خۆیەتی.)) ماری گووتی لەگەڵ خانم ماسۆن دا دەمێنێتەوە، تا قاپەکانی لە گەلا بشوات. خانم ماسۆن گووتی بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە دەبێ بەر لە هەر شتێك پیاوان لە ماڵ وەدەر بنرێن. بە سێ قۆڵی لە ماڵ هاتینە دەرێ.

هەتاوەکە بە شێوەیەکی ئەستوونی لە لەلانەکەی دەداو تیشکەکەی بەسەر دەریاکەوە تەحەمول نەدەکرا. چ کەسێك بەسەر کەنارەکەوە نەبوو. لە کابینەکانی قەراخ تەپەکەوە، کە دەیروانییە دەریاکە، دەنگی ئامان وقاپ و چەتالان دەهات. ئەو هالاوە گەرمەی کە لە تاوێرەکانەوە هەڵدەستا هەناسەی پیاوی سوار دەکرد. ریمۆن وماسۆن کەوتنە باسی کۆمەڵێك شت وخەڵکانێك کە من نەمدەناسین. ئیدی زانیم کە ئەمانە لە مێژە یەکتری دەناسن و ماوەیەکیش بەیەکەوە ژیاون. بەرەو دەریا چووین و بەکەناریا کەوتینە پیاسە. جار جار شەپۆلێکی چکۆلەی لەوانی دی گەورەتر دەهات و پێلاوەکەتانەکانی تەڕ دەکردین. من بیرم لە هیچ نەدەکردەوە چونکە ئەو هەتاوەی لەسەری کۆتی دەدام، خەواڵوی کردبووم.

لەم کاتەدا، ریمۆن شتێکی بە ماسۆن گووت کە باش گوێم لێ نەبوو. بەلام لە هەمان کاتا لە دووری دوورەوە، لەوسەری کەنارەکەوە، دوو عەرەبم بەجلی شینی کارەوە بینی کە بەرەو لا ئێمە دەهاتن. نیگایەکی ریمۆنم کرد و ئەو پێی گووتم: ((خۆیەتی)) ئێمە درێژەمان بە پیاسەکەمان دا. ماسۆن پرسی چۆن توانیویانە تا ئێرە تاقیبمان بکەن. لە دڵی خۆما بیرم کردەوە کە بیگومان کاتێ کە بەجانتای تایبەتی کەناری دەریاوە، سواری پاس بووین، دیتویانین. بەلام هیچم نەگووت.

عەرەبەکان هێدی هێدی دەهاتنە پێشێ ونەهۆ زۆر نزیك بوو بوونەوە. ئێمە رەوتی خۆمان نەگۆڕی وریمۆن گووتی: ((ئەگەر لێمان بوو بەشەڕ، ماسۆن تۆ ئالکاوی دووەمیان ببە ومن دەکەومە گیانی رەقیبەکەی خۆم. تۆش مەرسۆ ئەگەر کەسی سێیەم هات، دەست بکەوە.)) گوتم: ((باشە)) ماسۆن دەستەکانی خستنە گیرفانی. لەکە کە لەرادەبەدەر گەرم بووبوو نەهۆ سوور دەینواند. بە هەنگاوی هێدییەوە بەرەزو عەرەبەکان دەرۆیشتین. فاسیلەی نێوا نمان کەم و کەمتر دەبووەوە. کاتێ گەییشتینە نزیکی یەکترو چەند هەنگاوێکمان بۆ لای یەکتر مابوو، عەرەبەکان وەستان. من و ماسۆن پێمان سووك کرد. ریمۆن یەکسەر بەرەو رەقیبەکەی رۆیی. باش گوێم لێ نەبوو کە چی پێ گووت. بەلام عەرەبەکە خۆی ئامادەکرد کە بەر کەللەی بدات. هەنگێ ریمۆن جەزرەبەی یەکەمی وەشاند و بەتوندی ماسۆنی گازکرد. ماسۆن بەرەو لای عەرەبی دووەم رۆیی تا هێزی تیابوو دوو جەزرەبەی خێواندێ. کابرا بەسەرا کەوتە ناو ئاوەکەوە. چەند ساتێك بەودەقەوە مایەوە، لای سەرییەوە چەند بڵقە ئاوێك هاتە سەرێ. لەم ماوەیەدا ریمۆن لە رەقیبەکەی دەدا. و دەمووچاوی خڵتانی خوێن کردبوو. ریمۆن ئاوری لای منی دایەوەو گووتی: ((بزانە چی بەسەر دێنم.)) وهاوارم کرد: ((وریا بە چەقۆی پێیە.)) لێ تازە کار لەکار ترازابوو وبازوی ریمۆن بریندار بووبوو وزاری دادڕابوو.

ماسۆن تەکانێکی بۆ پێشەوە دا. بەلام عەرەبەکەی دیکەش هەستابووەوە خۆی گەیاندبووە پشت ئەو عەرەبەی کە چەقۆکەی پێ بوو. زاتی جوڵەمان نەبوو. ئەوان بە ئەسپایی و بێ ئەوەی چاو لەئێمە بگوازنەوە پاشە کشەیان کرد. بە هەرەشەی چەقۆ بەریان لێ گرتبووین. کە دیتیان مەدایەکی باش کەوتە

نێوا نمان، بەخێرایی پێیان وەغارێوە نا. کاتێ کە ئێمە لەژێر هەتاوەکەدا لەجێی خۆمان چەقی بووین، ریمۆن بازووی خۆی کە خوێنی لێ دەچۆڕا دەگوشی.

ماسۆن یەکسەر گووتی: دکتۆرێك هەیە کە یەکشەمموانی خۆی لەسەر گردەکە بەسەر دەبات. ریمۆن ویستی یەکسەر بچێ بۆ لای ئەو. بەلاَم هەرجارێ کە قسەی دەکرد، خوێنی زامەکەی لە زاریا بلقی دروست دەکرد. ژێر بالَیمان گرت و بە پەلە خۆمان گەیاندەوە کابینەکە. ولەوێندەر ریمۆن گووتی کە زامەکانی سوکەو دەتوانێ بۆ لای دکتۆر بڕوات. ئەو لەگەلَ ماسۆن دا رۆیی و من بۆ رونکردنەوەی رووداوەکە لای ژنەکان مامەوە. خانم ماسۆن دەگریاو ماری رەنگی پێ نەمابوو. رونکردنەوەی رووداوەکە بۆ ئەوان بێتاقەتی کردم. ئەنجام بێدەنگ بووم و بەدەم جگەرە کێشانەوە چاوم بڕییە دەریاکە.

ریمۆن وماسۆن نزیکەی سەعات یەك ونیوی پاش نیوەرۆ گەرانەوە. بازوی ریمۆن بەسترابوو و پلاستەری پزیشکی لە گۆشەی زاری نرابوو. دکتۆر پێی گووتبوو چ نییە. بەلاَم ریمۆن پەست بوو. ماسۆن هەولَی دا بیهێنێتە پێکەنین. بەلام هەر مات بوو. کاتێ گووتی کە دەخوازێ بۆ کەنار بڕوات، لێم پرسی بۆ، وەلاَمی دامەوە کە دەیەوێ هەوا بگۆڕێ. ماسۆن و من گووتمان لەگەلَی دەچین. هەنگێ تووڕەبوو و جنێوی دا. ماسۆن گووتی نەدەبوو تووڕەی بکەین. بەهەرحالَ من بەدوویدا رۆییشتم.

ماوەیەك بە قەراخی دەریاکەدا پیاسەمان کرد. گەرمای ئەم کاتەی هەتاوەکە لە کێشا نەبوو. پیاوی گێژ دەکرد. هەتاو بەسەر لەلاَنەکەو بەسەر دەریاکەدا دادەرژا. هەستم کرد ریمۆن دەزانێ کێوە دەچێ. بەلاَم بیگومان هەستەکەم هەلَە بوو. لەوسەری کەنارەکە، گەیینە کانییەکی چکۆلە کە لە پشت تاشەبەردێکەوەو لەناوجەرگەی چەوو لمەکەوە بەرەو دەریاکە هەلَدەقولَی و دەرۆیی. ئەو دوو عەرەبە لەوێندەر بوون. بەجلە کەوەیی و گریساوییەکانیانەوە راکشابوون. زۆر ئارام و تەقریبەن شاد دەهاتنە بەرچاو. هاتنی ئێمە هیچ شتێکی نەگۆڕی. ئەوەیان کە ریمۆنی بریندار کردبوو، بێ ئەوەی چ قسەیەك بکات نیگای ئەوی دەکرد. ئەوی تریان نەیەکی بەدەمەوە بوو ولە کاتێکا کە بەتیلەی چاو دەیڕوانییە ئێمە، پەیتا پەیتا ئەو سێ نۆتەیەی کە دەیتوانی بە نەیەکەی دەرییێنێ، دووبارە دەکردەوە.

بەدرێژایی ئەم ماوەیە هەر هەتاو بوو وهەمان بێدەنگی، لەگەلَ قولَەقولَی کانییەکەو سێ دانە نۆتەکەدا..ئەوجا ریمۆن دەستی برد بۆ ئەو گیرفانەی کە دەمانچەکەی تیا بوو. لێ رەقیبەکەی لە جێی خۆی نەجولاَ وبەو دەقەوە نیگای یەکتریان دەکرد، سەیرم کرد نەیژەنەکە قامکی پێیەکانی زۆر لەیەکدیییەوە دوورن. ریمۆن بێ ئەوەی چاو لە رەقیبەکەی بگوازێتەوە لێی پرسیم: ((تەقەی لێ بکەم؟)) بیرم کردەوە گەر بلَێم نە، ئەوا تووڕە دەبێ و تەقەی لێدەکات. بۆیە تەنیا ئەوەندەم گووت: ((خۆ هێشتا چ قسەیەکی پێ نەگووتویت. بۆیە ئەم جۆرە تەقەکردنە نامەردییە.)) جارێکی دیکە لەناو جەرگەی گەرماو بێدەنگییەوە گوێمان لە خوڕەخوڕی کانییەکە و نەوای نەیەکە بوو. ئەوجا ریمۆن گووتی: ((کەواتە من جنێوی دەدەمێ و کە وەلاَمی دایەوە بەرگوللەی دەدەم.)) وەلاَمم دایەوە: ((باشە، بەلاَم ئەگەر چەقۆکەی دەرنەهێنا بۆت نییە تیرەندازی بکەی.)) ریمۆن خەریك بوو تووڕە دەبوو. عەرەبەکەی دیکە هەر لەسەر نەیژەنینی خۆی بەردەوام بوو، وهەردووکیان تاقیبی رەفتار و ئەتواری ریمۆنیان دەکرد. بە ریمۆنم گووت: ((نە. تۆ پڕی بدەیێ ودەمانچەکەت بدە بە من. ئەگەر ئەوی دیکە یارمەتی دا یا رەقیبەکەت چەقۆکەی دەرهێنا، من تەقەی لێدەکەم.))

**کاتێ ریمۆن دەمانچەکەی دامێ، لەبەرتیشکی خۆرەکەدا بریقایەوە. لەگەڵ ئەوەشا، ئێمە هێشتا لە جێی خۆمانا چەقی بووین. لە تۆ وایە هەموو شتەکانی دەوروبەرمان دەرکەیان لە خۆ داخستبوو. بێ ئەوەی چاوان بتروکێنین، چاومان بڕیبووە یەکدی. لێرەدا هەموو شتێك لە نێوان دەریاو لم و هەتاوو بێدەنگی دووانەی ئاو و نەیەکەدا وەستابوو. لەم ساتەدا بیرم کردەوە ە مرۆڤ دەشێت تیرەندازی بکات و دەتوانێ نەیکات. و ئەم دووە یەکسانن. لێ لە نکاو عەرەبەکان پاشەکشەیان کردو چوونە پشتی تاوێرەکەوە. هەنگێ من و ریمون دووبارە دەستمان بە پیاسە کردەوە و لەوە دەچوو حاڵی ریمون باشتر بووبێ، باسی پاسی گەرانەوەی کرد.**

**هەتا کابینەکە لەگەڵیا رۆیشتم، کاتێ کە بە نەردەوانەکەدا سەردەکەوت، من لەبەردەم یەکەم پلەدا مامەوە، سەرم لەبەر تیشکی هەتاوەکەدا دنگەی دەهات و تاقەتی ئەوەم نەبوو بە پلیکانەکاندا سەربکەوم و دیسان ببم بە هاودەمی ژنەکان. بەڵام گەرماکە بە ڕادەیەك بوو کە بەلامەوە زەحمەت بوو بەوجۆرە وبێ جووڵە لە ژێر ئەو بارانە بە خورەمەی کە لە ئاسمانەوە دادەباری، راوەستم. وەستان یان ڕۆیشتن لەوێدا هەردوکیان یەك شت بوون. دوای تۆزێك بەرەو کەنارەکە گەڕامەوە و دەستم بە ڕێکردن کرد. هەمان تیشکی سوور بەرقەرار بوو، دەریا هەناسەی توندو بەکەفی وردە شە پۆلەکانی خۆی دەکرد بەرووی لمەکاندا. هێدی هێدی بەرەو تاشە بەردەکان هەنگاوم دەناو هەستم دەکرد تەوێڵم لەژێر خۆرەکەدا ئاوساوە. هەموو ئەم گەرمایە قورسایی دەخستە سەرم، و رێگەی لە پێشڤەچوونی ئەز دەگرت.هەرکاتێ کە هالاوی گەرمییەکە لەسەرو چاوی دەدام، ددانەکام دەنان بەیەکدا، کۆڵە مستم لەناو گیرفانەکانمدا دەگوشی، وبە هەموو هێزێکمەوە هەوڵم دەدا بەسەر هەتاوەکەداو بەسەر ئەم چڕەمەستییەدا کە شپرزەی کردبووم زاڵ ببم. لە گەڵ هەر تیرۆژیکا کە لە دەنکە لمێکەوە یا لە سەدەفێکەوە یا لە لەتە شووشەیەکەوە بەرز دەبووەوە، شەویلاگەم گرژ دەبوو. ماوەیەك ڕێم کرد. لەدوورەوە تا پۆی بچووك وتاریکی تاشەبەردەکەم دەبینی کە خەرمانەیەکی تیژی چاوکوێرکەر لە تیرۆژو غوباری دەریا دەوری دابوو. بیرم لە کانییە فێنکەکەی پشت تاشە بەردەکە کردەوە. حەزم دەکرد جارێکی دیکە قوڵە قوڵی ئاوەکەی بژنەوم. دەمویست لە خۆرەکە هەڵێم. لە تەقەلاو گریانی ژنەکان هەڵێم، دەمویست سایەو ئارامییەکەی ببینمەوە. لێ کاتێ کە زیاتر نزیك بوومەوە، سەیرم کرد حەریفەکەی ریمۆن دووبارە گەڕاوەتەوە. بەتەنێ بوو. بە پشتا خەوتبوو. دەستی نابووە ژێر سەری. نێوچەوانی لەبەر سێبەری تاشە بەردەکەدا بوو و ئەودوای بەدەنی لەبەر خۆرەکە بوو. جلە شینەکەی لە گەرما دوکەڵی دەکرد. کەمێکم پێ سەیر بوو. چیرۆکەکە بەلای منەوە کۆتایی هاتبوو و بەبێ هیچ مەبەستێك بۆ ئێرە هاتبووم. هەرکە منی بینی نیوە ئاخێزێکی کردو دەستی بۆ گیرفانی برد. هەڵبەتە منیش خۆ بەخۆ دەمانچەکەی ریمۆنم لە گیرفانی چاکەتەکەمدا گوشی. هەنگێ بێ ئەوەی دەستی لەگیرفانی دەربێنێ، خۆی بۆ دواوە برد. من تەواوێك ، نزیکەی دە دوانزە مەترێك لەوەوە دوور بووم. جارجارێ مانای روانینەکەیم لە نێوان پێڵوە نیوە نوقاوەکانیا دەخوێندەوە. بەڵام لەم هەوا گرگرتووەدا، وێنەکەی بەردەوام لەبەرچاوما دەرەقسی. دەنگی شە پۆلەکان لە نیوەرۆ خاوتر و درێژ تربوو. هێشتا هەر هەمان خۆر، هەمان تیرۆژو تیشك و هەمان لمەلان سەرانسەری ئێرەی گرتبووەوە. دوو سەعاتێك بوری رۆژ هەر لە جێی خۆی بوو. نەچووبووە پێشێ. دوو سەعات دەبوو کە رۆژ لە ئۆقیانوسێکی کانزای وەجۆش**

هاتگدا لەنگەری خستبوو. لە دوورەوە پەڵە هەڵمێکی بچووک تێپەری و من بەگۆشەی چاو تارماییەکەیم بینی. چونکە چاوم لە پیاوە عەرەبەکە نەدەگواستەوە.

بیرم کردەوە کە پێوست پێچێکی بۆ بکەمەوەو کۆتایی بەم مەسەلەیە بێنم. بەلاّم سەرانسەری کەنارە داغبووەکەی باوەشی هەتاو، نووسابوو بە پشتمەوە. چەند هەنگاوێکم بەرەو کانییەکە نا. پیاوە عەرەبەکە نەبزوا. هێشتاش هەر تەواو لێمەوە دوور بوو، رەنگە بەهۆی سێبەرەکەی سەر دەموچاوییەوە بووبێ کە لە تۆ وایە پێدەکەنێ. هەڵوەستەیەکم کرد. هەستم کرد کە دڵۆپە عارەقە لە نێو برۆکا نمدا کۆبووەتەوە. ئەمە هەمان ئەو هەتاوەبوو کە لە رۆژی ناشتنەکەی دایکم دیتبووم. رێك وەکو ئەو رۆژە، بەتایبەتی تەوێڵم دەیەشا و هەموو دەمارەکانی لەژێر پێستەکەیەوە پێکەوە لێیان دەدا. بەهۆی ئەو سۆزی گەرمایەوە کە نەمدەتوانی تەحەمولی بکەم جوڵەیەکم بەرەو پێشەوە کرد. دەمزانی کە ئەم جوڵەیە گەوجانیە، دەمزانی بەتاقە هەنگاوێك خۆم لەشەرِی گەرمای هەتاو رزگارناکەم. بەلاّم یەك هەنگاوم نا، تەنیا یەك هەنگاو بۆ پێشەوەو ئەمجارە کابرای عەرەب بێ ئەوەی لە جێی خۆی هەستێ، چەقۆکەی لە گیرفانی دەرهێنا و بەبەرچاوی منەوە دایە بەر تیشکی هەتاوەکە. تیشکی خۆرەکە لەدەمە پۆلاّیینەکەی دا و وەکو شفرەیەکی درێژی بریقەدار بەر تەوێڵم کەوت. لەم کاتەدا ئەو ئارەقەیەی کە لەسەر برۆکانم کۆبووبووەوە لە پرِ بەسەر پێڵوەکا نمدا دارژاو پەردەیەکی ئەستوری فێنکی بەسەردا هێنان. چاوەکانم لە پشت ئەم پەردەی ئەشك و خوێیەوە کوێرە بووبوون. ئیدی هەستم بە هیچ نەدەکرد جگە لە تیشکی هەتاوەکە کە دەیدا لە تەوێڵم، و بەشێوەیەکی هەست پێنەکراو ئەو بریقەیەی کە لە چەقۆکەوە بەرانبەرم دەبزوا. ئەم شمشێرە سووتێنەرە، برژانگەکا نمی دەخوارد و بەچاوانی پرِ ئازارمدا رۆدەچوو. رێك لەم کلاتەدا بوو کە هەموو شتەکان لەرزین. چرە هەڵمێکە گرگرتوو لە دەریاوە هەستا. وام هاتە بەرچاو کە سەرانسەری ئاسمان دەمی کردەوە تا ئاگر ببارێنێ. هەموو بوونم گرژ بوو، دەستم لەسەر دەمانچەکە توند بوو، زامنەکەی کرایەوە، دەستم بە دەسکە سافەکەیدا هێنا، ولێرەدا، لەناو هەراو زەنای وشك و کەرکەردا، هەموو شتێك دەستی پێکرد، ئارەقەو هەتاوەکەم لە خۆم تەکاند. ئیدی زانیم کە هاوسەنگی رۆژو کرِی و کپی ریز پەرِی کەنارەکەم سەنگەلا کردووە، ئەو کەنارەی لەسەریا خۆشحاڵ بووم. هەنگێ چوار جاری دیکە دەمانچەکەم نا بە جەستەیەکی بێ گیانەوەو گوللەکانی پێدا چوون، بێ ئەوەی چ شتێکی پێوە دیار بێ. ئەمە وەکو چوار سووکە تەقولباب بوو کە من لە دەرکەی بەدبەختیم دا.

## بەشی دووەم

((١))

یەکسەر دوای گرتنەکەم، چەندجارێك پرسوجۆم لەگەڵ کرا. بەڵام هەموو پرسوجۆکان لەمەڕ ناسنامەی من بوو و زۆری نەخایاند. یەکە مجار لە پۆلیسخانەدا وام دەهاتە بەرچاو کەس هەقی بەسەر کارەکەی منەوە نییە. دوای هەشت رۆژ، قازی بە پێچەوانەوە، کنەکارانە تەمەشای کردم، بەڵام لەسەرەتادا، تەنیا ناوم و ئەدرەس و کارو مێژووی لەدایکبوونی پرسیم. پاشان ویستی بزانێ کە ئاخۆ ئەوقاتم هەڵبژاردووە یان نا. پێم گووت هەڵمنەبژاردووە. جا هەر بۆ دڵنیایی لێم پرسی کە ئاخۆ ئەوقات پێویستە؟ گووتی: (( بۆچی دەپرسیت؟ )) وەڵامم دایەوە کە بەرای من قەزییەکەم زۆر سادەیە. بە پێکەنینەوە گووتی: (( ئەمەش بۆچوونێکە. لەگەڵ ئەمەشا یاسا لەبەر دەستدایە. ئەگەر تۆ ئەوقات هەڵنەبژێری، ئێمە بۆتی دادەنەین. )) لە دڵی خۆدا گووتم چەند باشە دادگا ئەم وردەکاریانەشی لە ئەستۆ گرتووە. ئەمەم بە قازییەکە گووت. پشتگیری قسەکەی کردم و بەوە برِانییەوە کە یاسا بەشێوەیەکی باش دانراوە.

لەسەرەتاوە ئەم پیاوەم بەهەند وەرنەگرت. لە ژوورێکا پێشوازی کردم کە پەردەکانی دادرابوونەوە. تەنیا یەك گڵۆپ لەسەر مێزەکەی بوو، کە ئەو کورسییەی کە منی لەسەر دانرابووم، روناك دەکردەوەو بەخۆی لە تاریکییەکەدا بوو. کاتی خۆی، زوو وەسفی دیمەنێکی لەم بابەتەم لە کتێباندا خوێندبووەوەو هەموو ئەمەم وەکو گەمە و نمایش دەهاتە بەرچاو. پاش گفتوگۆیەکەمان، بە پێچەوانەی تەسەوری خۆمەوە، سەیرم کرد پیاوێکی سیما ناسك، چاوشینی چاو درشتی بەقوڵاچوو، باڵابەرز، سمێڵ درێژی بۆز، وقژ زۆری مەیلەو سپییە. وەکو بنیادەمێکی زۆر بەهۆش ومەنتیقی هاتە بەرچاوم. هەرچەندە جارجارێ جوڵەیەکی لائیرادی زاری کرژ دەکرد ودەلالەتی لە تورەیی ئەو دەکرد، سیمای لەبەردڵان و خۆشەویست بوو. تەنانەت لە کاتی دەرچوونا بەتەمابووم تەوقەی لەگەڵ بکەم، بەڵام یەکسەر بیرم کەوتەوە کە من پیاوێکم کوشتووە.

بۆ سبەینێ ئەوقاتێك لە زیندانا هاتە دیدەنیم. پیاوێکی چکۆلەی خرکەڵەی مەیلەو گەنج بوو، بە دیقەت کرێمی لە قژی دابوو وتەخت و سافشانەی کردبوو. هەرچەند گەرمابوو( من بەتۆی کراسێکی قۆڵ کورت بووم. ) جل و بەرگێکی تۆخی یەخە هەڵگەڕاوەی لەبەردابوو، بۆینباخێکی سەیری موقەلەمی پانی رەش وسپی لەمل کردبوو. جانتایەکی بە بن هەنگڵەوە بوو، جانتاکەی لەسەر تەختە خەوەکەی من دانا و خۆی ناسادو پێی گووتم دۆسییەکەی خوێندوومەتەوەو قەزییەکەم حەساسە. و ئەگەر متمانەی پێ بکەم، ئەوا گومانی لەسەرکەوتن نابێ. سوپاسم کردو گووتی: (( جا ئێستا با بچینە سەر ئەسڵی مەسەلەکە. )) لەسەر تەختە خەوەکەم دانیشت و ئەوەی باس کرد کە هەندێ زانیاری لەسەر ژیانی تایبەتیم کۆکراوەتەوە. زانراوە کە دایکم تازە لە لەنگەرخانە مردووە. ئەوجا لە مارنکۆ هەندێ تەحقیق کراوە. تەحقیقکاران بۆیان دەرکەوتووە کە لەرۆژی ناشتنەکەی دایکما، من بێ موبالاتی و خەمساردیم نیشانداوە. ئەوجا پێی گووتم: (( هەڵبەتە بە خۆت دەزانی کە پێم ناخۆشە کە ئەم پرسیارەتان لێدەکەم، بەڵام زۆر زەرورییە، چونکە ئەگەر وەڵامێکی ئەم پرسیارەم دەست نەکەوێ، بە بەڵگەیەکی گەورەی تاوانباری دەژمێردرێ. )) دەیویست هاوکاری بکەم. لێی پرسیم کە ئایا لەو رۆژەدا خەمبار بووم. ئەم پرسیارەم بەلاوە سەیربوو، و وام بەخەیاڵدا هات ئەگەر من پرسیارێکی وام بکردایە زۆر نارەحەت دەبووم. لەگەڵ ئەمەشا وەڵامم دایەوە کە ماوەیەکە عادەی پرسیار کردنم لەخۆ لەدەست داوەو وەڵامی پرسیارەکەیم بەلاوە

زەحمەتە. بێگومان دایکم زۆر خۆش دەویست، بەلاّم ئەمە هیچی نەدەگەیانـد. هـەموو کەسێکی تەندروست کەم وزۆر ئارەزووی مەرگی ئەو کەسانە دەکەن کە خۆشیان دەوێن. لێرەدا پارێزەرەکە قسـەکەی پـێ بـڕیم و تەواو شڵەژا. ئیدی قەولی لێ وەرگرتم کە ئەم قسەیە نە لە دادگاو نە لەلای سەرۆکی دادگـا نەکـەم. ئیـدی بۆم باسکرد کە تەبیعەتم جۆرێکە کە بەزۆری پێداویستییە بەدەنییـەکانم، هەسـتەکانم دەشێوێنێ. ئـەو ڕۆژەی دایکم بەخاك سپارد، زۆر ماندووبووم و خەوم دەهات. بـەجۆرێ کـە چـەند شـتێکی ئـەو ڕۆژەم لـەبیر نـەماوە. ئـەوەی دەمتـوانی بـە دڵنیاییـەوە بیڵـێم ئەمـە بـوو کـە خـۆزیم دەخواست دایکم نەمردبایـە. لێ پارێزەرەکەم کە پێناچوو ئاسودە بێ گووتی: (( ئەمە بەس نییە. ))

لەفکران ڕاچوو. پرسی ئایا دەتوانم بڵێم کە لەو ڕۆژەدا بەسەر هەستە ئاساییەکانما زاڵ بووم؟ گـوتم: (( نە، چونکە ئەمە دروست نییە. )) بەشێوەیەکی سەیر نیگای کـردم، وەکـو ئـەوەی کـەمێك ڕقـی هەسـتێنم وبێـزاری بکـەم. بـەجۆرە فێڵبازییەکـەوە گـوتی بەهـەرحاڵ بەرێوەبـەرو کارمەنـدانی کەترەخانەکـە وەکـو شایەت گوێ لە قسەکانی من دەگرن و(( ئەمەش بۆ تۆ خراپ دەبێ )) دڵنیـام کـردەوە کـە ئـەم چیرۆکە هـیچ پەیوەندییەکی بە دۆزەکەی منەوە نییە، بەلاّم ئەو هەر ئەوەندەی گووت کە دیارە هەرگیز سەروکارم لەگەڵ دادگادا نەبووە.

ئەوجا بەتورەیی ڕۆیی. دەمویست ڕایگرم و تێی بگەیەنم کـە هـاودڵی ئـەوم مەبەسـتە نـەك بـۆ ئـەوەی باشتر بەرگریم لێ بکات، بەڵکو لەبەر ئەوەی بەتەبیعەت هـاودەردی ئـەوم دەوێ! بەتایبـەتی کـە هەسـتم کرد نارەحەتم کردووە. لەقسەکەی من تێ نەدەگەیی و لەبەر ئەمە کەمێك ڕقی لێم هەستا بـوو. حـەزم لێ بوو کە دڵنیای بکەم کە منیش وەکە هەموو خەڵکیم، تەواو وەکو هەموو خـەڵکی وەهـام. بـەلاّم هـەموو ئـەم شتانە لە ڕاستیا بێفایدەبوون ومن لەبەر تەمەڵی خۆم چاو پۆشیم لە گوتنیان کرد.

دوای تۆزێ هەمدیس بـۆلای قـازیی تـەحقیقیان بـردم. سـەعات دووی پـاش نیـوەرۆ بـوو. ئـەمجارەیان ژوورەکەی نوقمی تیشك بوو کە پەردە تۆڕییەکەی گلی نەدەدایەوە. زۆر گەرم بوو، دانیشـاندم وبـەڕێزێکی زۆرەوە پێی ڕاگەیاندم کە پاێزەرەکەم(( لەبەر هۆیەکی چاوەڕوان نەکراو )) نەهاتووە. جا من هەقم هەیـە کە وەلاّمی پرسیارەکانی نەدەمەوەو چاوەڕێ بکەم کە ئەوقاتەکەم بێت. لێ من گووتم بەخۆم دەتوانم وەلاّم بدەمەوە. قامکی نا بە دوگمەیـەکی سـەر مێزەکەیـدا. سکرتێرێکی لاو وەژوور کـەوت و تەقریبـەن لە پشت منەوە دانیشت.

هەردووکمان لەسەر کورسییەکانمان دانیشتبووین. پرس وجۆ دەستی پێکرد. هـەوەڵجار گـووتی وادیـارە تۆ بنیادەمێکی کەمدوو ومەندەی، وڕای منی لەمبارەیەوە دەوویست. وەلاّمم دایەوە: (( لەبەر ئەوەیە کە هیچ کاتێ شتێکی گرینگم نییە کە باسی بکەم. بۆیە قسە ناکەم. )) وەکو جاری پێشوو پێکـەنی و سـەلماندی کـە ئەمە باشترین بەڵگەیە و لەسەری ڕۆیی: (( بەلاّم ئەمە هیچ بایـەخێکی نییـە )). بێـدەنگ بـوو، نیگایـەکی کردم و لە پڕ خۆی ڕاست کردەوەو بە پەلە پەل پێی گووتم: (( مـن تـەنیا خـۆتم مەبەسـتە. )) دروست لـە مەبەستی حاڵی نەبووم و هیچ وەلاّمێکم نەدایەوە. لەسەری ڕۆیی کە: (( هەندێ لایەنی ئەم کارەی تۆ هەیە کە سەریان لێدەرناکەم. هەڵبەتە دڵنیام کە یارمەتیم دەدەی تا لێیان حـاڵی بـبم. )) گـووتم شـتەکان زۆر سادەن. ناچاری کردم کەشتەکانی ئەو ڕۆژەی دووبارە بۆ بگێڕمەوە. بـەکورتی ئـەوەی کـە لـەوەو پـێش بـۆم باسکردبوو، بۆم گێڕایەوە: ڕیمۆن، کەناری دەریا، مەلەوانی، شەڕوقەرقەشـە، دیسـانەوە کـەنار، کانییـە

چکۆلەکە، هەتاوو پێنج فیشەکی دەمانچەکە. لەسەری هەر ڕستەیەکدا دەیگووت: (( زۆر باشە، زۆر باشە. )) کە گەییمە سەر جەستە کەوتووەکە هەمدیس پشتگیری قسەکەی کردم و گووتی: (( زۆر باشە )). لەدووباره کردنەوەی ئەم حیکایەتە بێتاقەت بووبووم وهەستم دەکرد هەرگیز ئەوەندەم قسە نەکردبوو.

دوای تۆزێك هەستاو گووتی دەیەوێ یارمەتیم بدات، چونکە بووم بەمایەی بایەخی وی و پەنا بەخوا کاریکم بۆ دەکات. بەلاّم هەوەلّجار ویستی دیسان هەندێ پرسیارم لێبکات، یەکسەر لێی پرسیم کە دایکم خۆشدەویست، گووتم: (( بەلّێ وەکو هەموو خەلّکی. )) و سکرتێرەکە کە تا ئەم کاتە بەردەوام تایپی دەکرد، وەك بلّێی بە هەلّە تایپەکەی لێدا، چونکە لە کارەکەی وەستاو ناچار ئاوڕی دواوەی دایەوە. قازییەکە هەمدیس بێ هیچ هۆیەکی ئاشکرا لێی پرسیم: (( ئایا هەر پێنج گوللەکەم دوا بەدوای یەك تەقاند؟ کەمێك لەفکرانراچووم و گووتم هەوەلّجار یەك گوللەم تەقاند، و پاش چەند ساتێك چوارەکەی دیکە، هەنگێ گووتی:(( بۆچی لە نێوان یەکەم و دووەمدا هەلّوەستەت کرد؟ )) جارەکی دی کەنارە سورەوەبووەکەم لەبەرچاو بەرجەستە بوو و هەستم بەگەرمییە سووتێنەرەکەی لەسەر تەوێلّم کرد. لێ ئەمجارە هیچ وەلاّمێکم نەدایەوە. لەماوەی ئەو بێدەنگییەی پاش ئەمە، قازی پەشێو دەینواند، دانیشت. قامکەکانی خستە ناو قژی، ئانیشکەکانی دادایە سەر مێزەکەی و بەسیمایەکی غەریبەوە تۆزێ بەلای منا دانەوییەوە: (( لەبەرچی؟ بۆچی تەقەت لە جەنازەیەکی بێگیان کرد؟ )) هەمدیس نەمزانی چ وەلاّمێکی بدەمەوە. قازی دەستی بەناوچەوانی خۆیدا هێناو پرسیارەکەی بەتۆزێ دەسکارییەوە دووبارە کردەوە: (( لەبەرچی ؟ دەبێ پێم بلّێی لەبەرچی؟ )) بێدەنگ بووم.

لە پڕ هەستا، بە پەلە چوو بۆ ئەوسەری ژوورەکە، چەکمەجەی مێزێکی راکێشا. خاچێکی زیوینی بە نەخشی عیسای لێ دەرهێنا ولە حالێکا دەیجولاّند بەرەو لای من هات و بەدەنگێکی لەرزۆك کە تەواو گۆڕابوو هاواری کرد: (( ئایا ئەمە دەناسیت، ئەمە ئەمە؟ )) گووتم: (( بەلّێ، هەلّبەتە )) ئەوجا زۆر بە پەلەو بە هەلّچوونەوە گوتی کە باوەڕی بەخوا هەیە کە هیچ مرۆڤێك ئەوەندە گوناحکار نییە کە خوا نەتوانێ بیبەخشێت. بەلاّم بۆ ئەم کارە مرۆڤ دەبێ تۆبە بکات، پەشیمان ببێتەوەو ببێتەوە بە منالێ کە ویژدانی پاك ببێتەوەو ئامادەی قەبولکردنی هەر نەخشێك بێ. هەموو هەیکەلی خۆی دابوو بەسەر مێزەکەدا. خاچەکەی تەقریبەن بەسەر سەری منەوە تەکان دەدا. راستت دەوێ، من بە باشی پەیگیری قسەکانیم نەکرد، چونکە گەرمام بوو و چەند مێشێکی گەورە لەژوورەکەدا بوون کە بەدەمووچاومەوە دەنیشتنەوە. هەروەها لەبەر ئەوەی بەخۆی تۆزێك خستبوومیە ترسەوە. لەهەمان کاتدا هەستم دەکرد ئەم ترسە مایەی پێکەنینە. چونکە بەهەموو حالێ وحەساوێك تاوانبارەکە من بووم. بەلاّم ئەو هەر بەردەوام بوو. ئیدی کەم دابێژێك بۆم دەرکەوت کە بە بۆچوونی ئەو تەنیا یەك خالّی تاریك لە قسەکانی مندا هەیە، ئەویش ئەوەیە کە چ شتێك بووە هۆی هەلّوەستە کردنم لەنێوان گوللەی یەکەم وگوللەکانی دواترا. ئەو دوای قەزییەکە زۆر باش بوو، لێ ئەو تەنیا سەری لەم خالّە دەرنەدەکرد.

دەمویست تێی بگەیەنم کە پێ داگرتنی ئەو بێهودەو هەلّەیە. چونکە ئەم خالّەی دوایی ئەو بایەخەی نییە. لێ ئەو قسەکەی بڕیم و لە کاتێکا بە پێوە وەستا بوو بۆ جاری دووەم هانی دەدام وەلاّم بدەمەوە، لێی پرسیم کە ئایا باوەڕم بە خوا هەیە. وەلاّمم دایەوە نە. بەتوڕەیی وبێزاری دانیشت. گووتی ئەمە مەحالّە،

گووتی هەموو خەڵکی باوەریان بە خوا هەیە. تەنانەت ئەوانەش کە روویان لێوەرگێڕاوە. ئەمە باوەڕی ئەو بوو. ئەگەر رۆژێ گومانی لەوە بکردایە، ئیدی ژیانی مانایەکی نەدەبوو. هاواری کرد: (( ئایا دەتەوێ ژیانم مانایەکی نەبێ؟ )) بەرای من ئەمە پەیوەندییەکی بە منەوە نەبوو وپێم گووت. لێ لەم کاتەدا لەسەر مێزەکەی پەیکەرێکی مەسیحی لە بەرچاوم راگرت و شێت ئاسا هاواری کرد: (( من مەسیحیم داوا لەم دەکەم کە لە گوناهەکانی تۆ خۆش بێ، چۆن باوەڕت بە کەسێك نییە کە لە پێناوی تۆدا رەنجی کێشاوەو ئازاری چەشتووە؟ )) هەستم کرد بەشێوەیەکی خۆیی دەمدوێنێ، بە وشەی (( تۆ )) دەمدوێنێ. لێ شەکەت و بێتاقەت بوو بووم. گەرماکە زیاتر زیاتر دەبوو، وەکو هەمیشە کە کاتێ دەمەوێ خۆم لە دەستی کەسێك رزگاربکەم گوێ لە قسەکانی ناگرم، حاڵەتێکم لە خۆگرت لە تۆوایە بە بۆچوونەکانی قایلم، وپێم سەیر بوو کە وایزانی سەرکەوتووەو گووتی: (( دەبینی، دەبینی کە باوەڕت پێیەتی، و ئێستا دەتەوێ ئیمانی پێ بێنی؟ )) هەڵبەتە جارێکی دیکەش گووتم نە. کەوتە سەر کورسییەکەی خۆی.

زۆر ماندوو دیار بوو. کەمێك بێدەنگ بوو. لەم کاتەدا تایپەکە، کە لە نووسینی گفتووگۆیەکە دوا نەدەکەوت، دوا رستەکانی لێدا. ئەوسا بەوردی و کەمێك خەمینییەوە تەمەشای کردم، و لە ژێر لێوەوە گووتی: (( من هەرگیز روحێکی بە بەردبووی وەکو روحی تۆم نەدیوە. ئەو تاوانبارانەی کە تا نهۆ رووبەرووی من بوونەتەوە، هەر هەموویان لە بەردەم ئەم وێنەی ئازارو خەمەدا کەوتوونەتە گریان. ))
ویستم بڵێم کە گریانەکەیان لەبەر تاوانباریان بووە. بەلاّم بیرم کردەوە کە منیش وەکو ئەوانم. نەمدەتوانی ئەم بیرە قبوڵ بکەم. ئیدی قازییەکە هەستا. وەك ئەوەی بڵێ کە پرس و جۆیەکە تەواو بوو. بەلاّم بە هەمان سیمای نەختێ شەکەت و تەنیا لێی پرسیم ئایا لە کارەکەی خۆم ژێوانم . بیرم کردەوەو گووتم لە جیاتی پەشیمانی راستەقینە هەست بە جۆرە پەستی و خەمینییەك دەکەم. هەستم کرد لە مەبەستم حاڵی نەبوو. بەلاّم ئەو رۆژە کارەکان لێرەدا وەستان و هێوەتر نەچوون.

ئیدی لەوە بەدواوە زۆر جار قازییەکەم دەبینی، بەلاّم هەموو جارێ هەر لەگەڵ پارێزەرەکەمدا بووم. هەموو جارێ بەوە دەبڕایەوە کە هەندێ خاڵیان لەمەڕ ئیعترافەکانی پێشووم بۆ روون بکەمەوە. قازییەکەم و پارێزەرەکەم هەندێ باس و خواسیان لەمەڕ هە نجەتەکانم دەکرد. بەلاّم ئەوی راستی بێ ئەوان لەودەمانەدا هیچ بایەخێکیان بە من نەدەدا. بەهەر حاڵ بەرەبەرە رەوت و تۆنی پرس و جۆیەکان گۆڕان. وادیار بوو کە قازییەکە چیتر منی بەلاوە مەبەست نییە و داوەری خۆی سەبارەت بە من بەشێوەیەك لە شێوەکان تەواو کردووە، چیتر باسی خوای لەگەڵ نەکردم. چیتر بەو هەڵچوونەی یەکەم رۆژەوە نەم بینی. بەکورتییەکەی گفتوو گۆیەکەی نێوا نمان گەرمترو دۆستانەتر بووبوو. چەند پرسیارێك، چەند قسەیەك لەگەڵ پارێزەرەکەما، وئەوجا پرس و جۆیەکان تەواو دەبووبەگووتەی قازییەکە، قەزییەکەم رەوتی خۆی دەبڕی. وهەندێ جارش کە باس باسی بابەتە گشتییەکان بوایە، منیشیان تیا بەشدار دەکرد. بەرەبەرە پشووم وەبەرهاتەوە. لەم سەعاتانەدا هیچ کەسێك دژم نەبوو. شتەکان هێندە ئاسایی و رێك و پێك و وردو بەقایدە بەرێوە دەچوون، گەوج گەوج وام خەیاڵ دەکرد کە (( بووم بە پێڕی ئەوان. )) لە کۆتایی ئەم پرس و جۆیانەدا کە یانزە هەیڤی خایاند، دەتوانم بڵێم کە سەیرم پێدەهات کە هەرگیز لە هیچ شتێك ئەوەندەی ئەو ساتە دەگمەنانە لەزەتم نەدەبرد کە قازییەکە منی تا بەردەرکەی ژوورەکەی بەرێ دەکرد

وبە سەدایەکی دۆستانە دەیگووت: ((بۆ ئەمڕۆ بەسە جەنابی دژە مەسیح.)) ئەوسا بەدەستی پۆلیسیان دەسپاردم.

((٢))

هەندێ شت هەن کە هەگیز حەزم نەکردووە باسیان بکەم. کە چوومە زیندانەوە، وای چەند رۆژێك بۆم دەرکەوت کە حەزناکەم تاقە یەك وشە دەربارەی ئەم بەشەی ژیانم باس بکەم.

پاشان زانیم کە ئەم حەزنەکردن و بێ مەیلییەش هیچ پایەو بناغەیەکی نییە. لەراستیدا لە رۆژانی هەوەڵدا هەستم بە زیندانی بوونی خۆم نەدەکرد چونکە بەشێوەیەکی نادیارو ئاڵۆز چاوەنۆڕی رووداوێکی تازە بووم. ئەم رووداوە پاش یەکەمین و لەهەمان کاتدا دوایەمین دیدەنی ماری روویدا. لەو رۆژەوە کە کاغەزەکەیم پێ گەیی ( بۆی نووسی بووم چونکە ژنی من نییە چیتر مۆڵەتی نادەن دیدەنیم بکا. ) بەڵێ لەو رۆژە بەدواوە هەستم کرد کە ئەم ژووری زیندانە ماڵی منەو ژیانم لێرەدا دەوەستێ. ئەو رۆژەی کە دەسگیریان کردم، هەوەڵجار لە ژوورێکا زندانیان کردم، کە زندانییانێکی زۆری تیا بوو، زۆربەیان عەرەب بوون. ئەوانە هەرکە منیان بینی پێکەنین، پاشان لێیان پرسیم کە چیم کردووە، گووتم عەرەبێکم کوشتووە، وئیدی ئەوان بێدەنگ بوون. بەلام دوای کەمێك شەو بەسەرا هات، فێریان کردم کە چۆن حەسیرەکەی ژێرم بۆ خەوتن رێك بخەم، بە لوول دانی سەرێکی، سەرینێك دروست دەکرا. بە درێژایی شەوەکە مێشولە بەسەر سەروچاوما تەراتێنیان کرد. دوای چەند رۆژێك بۆ ژوورێکی تەنیایان بردم کە لەوێ لەسەر تەختێکی دار دەخەوتم. لەگەنێکم لە جیاتی ئاودەست هەبوو. تەشتۆکەیەکی ئاسنیشم هەبوو. زندانەکە رێك کەوتبووە سەرووی شارەوە، لە کلاورۆژنەیەکەوە دەمتوانی دەریا بدینم. رۆژێك کە خۆم بە شیشبەندەکەوە نووساندبوو و رووم کردبووە روناکییەکە، پاسەوانێك وەژوور کەوت و پێی گووتم کە میوانم هاتووە. لە دڵی خۆدا گوتم ماری یە. هەرواش بوو.

بۆوەی بگەینە ژووری دیدەنی، بە دالانێکی درێژا، پاشان بە قالدرمەیەکا و ئەوجا بەرارەوێکی دیکەدا رەتبووین. چووینە ناو هۆڵێکی زۆر گەورەوە، لەدەرگایەکی گەورەوە روناکی تێدەکەوت. دوو موحەجەری ئاسن درێژایی هۆڵەکەیان دەبڕی وکردبوویان بەسێ بەشەوە. لە نێوان دوو موحەجەرەکەدا مەیدانێکی هەشت تا دە مەتری دروست بووبوو کە مواجەهەچییەکان و زندانییەکانی لێکدی جیا دەکردەوە. ماریم لە بەرانبەر خۆدا، بەجلە موقەلەم و دەموچاوە تاوانگازەکەیەوە بینی. دە دوانزە زندانییەك کە زۆربەیان عەرەب بوون لە تەنیشت منەوە وەستابوون. چواردەوری ماری ژنانی جەزایری ناوچەیی بوو، کەوتبووە نێوان دوو ژنی مواجەهەچییەوە: پیرەژنێکی زیتەڵەی لێو هەڵقورتاوی رەشپۆش، و ژنێکی قەڵەوی سەررووت کە زۆر بەدەنگی بەرز بە حەرەکەوە قسەی دەکرد. بەهۆی مەودای نێوان موحەجەرەکانەوە مواجەهەچییەکان و زندانییەکان ناچار بوون بەدەنگی بەرز قسە بکەن. کاتێ وەژوور کەوتم غەڵبە غەڵبی دەنگەکان کە لەسەر دیوارە رووتەکەی هۆڵەکە دەنگی دەدایەوە، ئەو تیشکە تیژەی کە لە ئاسمانێ ڕا دەیدا لە شووشەکان و لە هۆڵەکەدا پەخش و بلاو دەبووەوە سەرەگێژکەیان پێخستم. ژووری زندانەکە زۆر هێدیتر و تاریکتر بوو. چەند ساتێکم دەویست تا بەم وەزعە ڕابێم. ئەوجا سیماکانم لەبەر روناکی ژوورەکەدا بە جوانی لێدەرکەوت. بینیم پاسەوانێك لەوسەری دالانەکەو لە نێوان دوو موحەجەرەکەدا

وەستاوە. زۆربەی زیندانییە عەرەبەکان بەرانبەر بە خزم و کەسوکاریان، بە چیچکانەوە دانیشتبوون. ئەمانە هاواریان نەدەکرد. وێرای ئەو هەموو هەراو زەنایە بە ئەسپایی قسانیان دەکردو لە قسەی یەکدیش حاڵی دەبوون. چپە مەنگەکانیان کە لە خوارەوە دەهات تێکەڵ بەو گفتو گۆیانە دەبوو کە لەسەریانەوە دەکران. هەموو ئەمانەم زۆر بە خێرایی بۆ دەرکەوت و بەرەو لای ماری چووم. خۆی دابوو بە شیشبەندەکەدا، بە هەموو توانایەوە بۆم دەخەنی، لەبەرچاوم زۆر جوان بوو، بەلاّم نەمتوانی ئەوەی پێ بڵێم.

بەدەنگی بەرز گووتی: (( چۆنی؟ )) وەلاّمم دایەوە: (( هەر وادەبێ )) گووتی: (( باشی، هەموو شتێکت هەیە؟ )) وەلاّمم دایەوە:(( بەڵێ، هەموو شتێك. ))

بێدەنگ بووین و ماری هەر پێدەکەنی. ژنە قەڵەوەکە بەرەو هاوسێکەی من هاواری دەکرد کە بێگومان مێردی بوو. پیاوێکی چوارشانەی قژزەردی جوان بوو. قسەکەیان پاشماوەی گفتو گۆیەك بوو کە ماوەیەك پێشتر دەستیان پێکردبوو.

ژنەکە بە هەموو هێزییەوە هاواری کرد: (( جان نایەوێ وەری بگرێ )) پیاوەکە دەیگوت: (( بەڵێ، بەڵێ )) — پێم گووت کە هاتییە دەرێ وەری دەگریتەوە، بەلاّم جان رازی نەبوو وەری بگرێ.

ماری لە پاڵ ئەو ژنەوە هاواری کرد کە ریمۆن سلاّوم لێدەکات و من گووتم: (( سوپاس )) بەلاّم دەنگی من لەناو دەنگی هاوسێکەمدا کە پرسی: (( ئایا حاڵی باشە )) گووم بوو. ژنەکە پێکەنی و گووتی: (( هیچ کاتێك ئەوەندە باش نەبووە. )) ئەوەی دەستە چەپم، پیاوێکی وردیلەی گەنج بوو، جووتێ دەستی ناسکی پێوە بوو و هیچی نەدەگووت. سەیرم کرد کە بەرانبەر بە پیرەژنێکی لاواز دانیشتووەو هەردووکیان بە تامەزرۆیی چاویان بڕیوەتە یەکدی. نەمتوانی لەوەی پتر لێیان وردببمەوە، چونکە ماری بەرەو من هاواری کرد کە دەبێ بە ئومێد بم. گووتم: (( بەڵێ )) و لەهەمان کاتا تەمەشای ئەوم دەکرد و حەزم دەکرد لەسەر کراسەکەیەوە شانی بگوشم. هەوەسی ئەو قوماشە ناسکە لە کەللەی دابوم و بەچاکی دەمزانی کە جگە لەو بە چ شتێك ئومێدەواربم. ماری دەیویست ئەمە بڵێ. ماری هەر پێدەکەنی. من جگە لە بریقەی ددانەکانی ، و وردەچرچی دەوری چاوەکانی چیترم نەدەبینی. دووبارە هاواری کرد: (( دێیتە دەرێ و زەماوەند دەکەین! )) وەلاّمم دایەوە: (( پێت وایە؟ )) ئەم رستەیەم هەر بۆ ئەوە گووت کە شتێکم گووتبێ. هەنگێ بە دەنگی زۆر بەرزو خێرا گووتی: بەڵێ، وگووتی کە من تەبرێ دەبم و دووبارە دەچینە مەلەوانی. لە پاڵ ماری دا، ئەو ژنە هاواری دەکرد کە زەمیلەیەکی لە نوسینگەکە داناوەو شتەکانی ناو زەمیلەکەی یەك یەك دەژمارد تا وەریان بگرێ، چونکە نرخیان گران بوو. هاوسێکەی دیکەی من و دایکی هەر بەو دەقەوە نیگای یەکتریان دەکرد. چپەچپی عەرەبەکان لە خوارەوە بەردەوام بوو. لەدەرێ ڕا وادیار بوو کە روناکی لەبەر پەنجەرەکەدا شەپۆل دەدا. روناکی وەکو خۆشاوی تازەی میوە بەسەر سەروچاوەکانا دەڕۆیی.

هەستم دەکرد بێتاقەتم و دەمویست بڕۆم. غەڵبە غەڵبەکە ئەزیەتی دەدام. بەلاّم لە لایەکی دیکەوە دەمویست تێر تەمەشای ماری بکەم. نەمزانی چەند وەخت بوری. ماری باسی کارەکەی خۆی دەکردو بەردەوام دەخەنی. چپەچەکان، هەراو زەناکان و گفتو گۆکان تێکەڵ بەیەکدی دەبوون. تاقە دورگەی مات وکپ تەنیشتی من بوو، لەو شوێنەی کە ئەم لاوە وردیلەیەو ئەو پیرەژنە دەیانڕوانییە یەکدی. وردەوردە عەرەبەکانیان برد. هەرکە نەفەری یەکەم ڕۆیی، ئیدی هەموو بێدەنگ بوون. پیرەژنەکە خۆی لە

شیشبەندەکە نزیك کردبووەوە، ولەم کاتەدا پاسەوانەکە ئاماژەیەکی بۆ کوڕەکەی کرد، وئەویش گوتی: (( بە هیوای دیدار دایکە. )) دایکەکە دەستی لەنێو دوو شیشەوە درێژ کرد تا کورتە ئاماژەیەکی خاو و درێژی بداتێ.

پیرەژن رۆیی. لەم کاتەدا پیاوێکی کلاو بەدەست وەژوور کەوت و شوێنەکەی ئەوی گرت. زندانییەکیان هێنا، ئەو جووتە زۆر بەگەرمی قسەیان دەکرد، بەلاّم بە ئەسپایی، چونکە هەمدیس بێدەنگی باڵی بەسەر هۆڵەکەدا کێشابوو. هاتن بە سۆراخی یارۆی دەستە راستی منەوە، و ژنەکەی بێ ئەوەی دەنگی نزم بکاتەوە، وادیار بوو هێشتا نەیزانی بوو کە چیتر پێویست بە هاوار کردن ناکات، پێی گووت: (( ئاگاداری خۆت بەو وریابە. )) ئەوجا نۆرە هاتە سەر من. ماری بە ئاماژە ماچێکی تێ گرتم. بەرلەوەی لە چاوی ونبم، دووبارە ئاوڕم دایەوە. بێ جوڵە بوو، دەموچاوی خۆی بەهەمان خەندەی درێژو چرەوە نابوو بە موحەجەرەکەوە.

دوای ماوەیەکی کەم نامەیەکی بۆ نووسیم. لەمە بەدواوە ئەو شتانە دەستیان پێکرد کە هەرگیز حەزم نەکردووە باسین بکەم، حەزناکەم موبالەغە بکەم، ئەمە بۆ یەکێکی وەکو من لەخەڵکانی دی ئاسانتر بوو. لەسەرەتای حەپسییەکەمدا ناخۆشترین شت بەلای منەوە ئەمە بوو کە بیرکردنەوەم وەکو بیرکردنەوەی مرۆڤێکی ئازاد وابوو. بۆ نمونە ئارەزووم دەکرد بچمە کەناری دەریا. دەنگی هەوەڵین شەپۆلانی ژێر پێیەکانم، چوونم بۆ ناو ئاوەکە، ئەو ئاسودەی و ئیسراحەتەی کە لەوە دەمبینی، هەموو ئەمانەم لای خۆم بەرجەستە دەکرد. و لە پڕ هەستم دەکرد کە چوار دیواری زندانەکەم چەند تەنگە، چەند هاتوونەتەوە یەك، بەلاّم ئەم حاڵەتە تەنیا چەند مانگێك بەردەوام بوو. لەوە بەدواوە وەکو زیندانییەك بیرم دەکردەوە: چاوەروانی ئەو رۆژانە پیاسەیە دەبووم کە لەناو حەساری زیندانەکەدا دەمکرد. یان دادەنیشتم و چاوەروانی پارێزەرەکەم دەکرد. باقی وەختەکەم بەباشی رێك خستبوو. هەنگێ بەزۆری وام خەیاڵ دەکرد کە ئەگەر ناچاریان کردبام، لە کلۆری دارێکی وشکا بژیم، و چ کارێکم نەبوایە جگە لە تەمەشاکردنی گوڵی ئاسمان، هەنگێش وردە وردە ڕادەهاتم.( لێرەدا مەرسۆ ئاسمان وەکو گوڵێك بەدیار سەرییەوە دەبینێ). لەم حاڵدا وەختی خۆم بەدەم چاوەروانی تێپەڕینی باڵندان، ویا بەچاوەروانی یەکانگیری هەورانەوە دەگوزەران. وەکو چۆن لێرەدا چاوەڕوانی دیتنی بۆینباخە سەیرەکانی پارێزەرەکەمم، یا وەك چۆن لە جیهانێکی دیکەدا رۆژانم دەژمارد کە شەممە بێ تا ماری لەباوەش بگرم. بەڵێ کە لەفکرانرا دەچووم، لەناو کلۆرە دارێکی وشکدا نەبووم. خەڵکانی لە منیش نەگبەت تر هەبوو. بەڵێ، ئەمە بۆچوونی دایکم بوو و بەزۆری دووبارەی دەکردەوە کە مرۆڤ لەگەڵ هەموو شتێکدا ڕادێ.

بەهەرحاڵ زۆریش لەم خەیالاّنە دوور نەدەکەوتمەوە. مانگەکانی سەرەتا ناخۆش بوو. بەلاّم بەزەبری ئەو هەوڵ و تەقەللایەی دەمدا تێم دەپەڕاندن. بۆ نموونە ئارەزووی ژن ئەزیەتی دەدام. ئەمە ئاسایی بوو. من گەنج بووم. هەرگیز بەتایبەتی بیرم لە ماری نەدەکردەوە. بەلاّم بەجۆرێ بیرم لە ژنێك، لە ژنان، لە هەموو ئەو ژنانەی کە ناسیبوومن، ولە هەموو ئەو کات و شوێنانەی کە ئاشقێنیم لەگەڵدا کردبوون، دەکردەوە، کە ژوورەکەم پڕ دەبوو لە سیمای ئەوان و لە ئارەزووەکانی من. ئەمە لە لایەکەوە هاوسەنگی هزری منی دەشێواند، بەلاّم لە لایەکی ترەوە وەختەکەی دەکوشت. لە ئە نجاما کاتێ کە ئاشنایەتیم لەگەڵ سەرپاسەواندا، کە لەکاتی خواردن دابەشکردندا لەگەڵ شاگرد ئاشپەزەکەدا دەهات، پەیدا کرد،

ئەم خەیالآتانە کۆتاییان هات. ئەو هەوەڵجار باسی ژنانی لەگەڵ کردم، و گووتی ئەمە گەورەترین شتە کە خەڵکی پێوەی دەناڵێنن. گووتم منیش وەکو ئەوانم و ئەم جۆرە رەفتارانە بە ناڕەوا دەزانم. گووتی: (( بەلاّم رێك لەسەر ئەم بابەتەیە کە ئێوە دەخەنە زندانەوە. — چۆن لەسەر ئەم بابەتەیە؟ -بەڵێ، لەسەر ئەم بابەتەیە، ئەمە ئازادییە. لە ئازادی مەحرومتان دەکەن. ))

من هەرگیز بیرم لەم مەسەلەیە نەکردبووەوە. قسەکەیم سەلماند. گووتم: (( دروستە ئەگەر ژن هەبێ، سزایەك نامێنێ. گووتی: بەڵێ، تۆ لەشتان دەگەی، تۆ نەك ئەوانی دی، بەلاّم ئەوانی دیکەش دەگەنە ئەم ئەنجامەی کە خۆیان هۆکاری تەسکینی خۆیان فەراهەم بکەن. خۆیان ڕابێنن. )) ئەوجا پاسەوانەکە رۆیی.

جگەرەش مەسەلەیەك بوو. کە هاتمە ناو زندان، پشتێنەکەم، قەیتانی پێلاّوەکانم، بۆینباخەکەم و هەرچییەکم لە گیرفانا بوو ، بەتاییەتی جگەرەکانیان لێ سەندم. لە زندانەکەمدا جارێکم داواکرد کە جگەرەکانم بدەنەوە. بەلاّم گووتیان قەدەغەیە. رۆژانی یەکەم زۆر زەحمەت بوو، ورەنگە هەر ئەمەش لە هەر شتێکی دی داغانی کردبم، تەلزمە دارم لە تەختەکەی ژێرم دەکردەوەو دەمجوو. بە درێژایی رۆژ دڵم تێك هەڵدەهات. نەمدەزانی بۆچی لە شتێکیان مەحرووم کردووم کە زیانی بە چ کەسێك نەدەگەیاند. پاشان بۆم دەرکەوت کە ئەم مەحرومیەتەش بەشێکە لە سزا. لەم ساتە بەدواوە خۆم راهێنا کە چیتر جگەرە نەکێشم. ئیدی ئەم سزایەش بۆ من حوکمی سزای نەما.

ئەم وردە نارەحەتیانی لێ دەرچێ، ئیدی حاڵم زۆر خراپ نەبوو. گرنگترن شت دیسانەوە کوشتنی وەختەکە بوو. بەلاّم لەوساتەوە کە فێربووم بیرەوەریانی رابردوو دووبارە زندوو بکەمەوە ئیدی هیچ شتێك بێتاقەتی نەدەکردم. هەندێ جار دەکەوتمە بیرکردنەوە لە ژوورەکەم و بە خەیاڵ لە سوچێکەوە بۆ گۆشەیەکی دیکەی ژوورەکەم دەرۆییشتم، یەك یەك شتەکانی سەر رێگەمم دەژمارد. هەوەڵجار ئەم کارە زوو تەواو دەبوو. بەلاّم هەر کەرەتێ کە دووبارە دەستم پێدەکردەوە، کەمێك زیاتری دەبرد. چونکە یەك یەك کەل و پەلەکان و دەربارەی هەر کەلو پەلێکی ژوورەکە، هەر شتێکە بەسەرەوە بایە و دەربارەی هەر شتێك هەموو وردەکارییەکانی و تەنانەت خودی وردەکارییەکانیش، لە نەخشێکەوە بیگرە تا درزێك یا قەراخێکی شکاو، و رەنگ و پەڵەکانی سەر شتەکانم وەبیر دەهێنایەوە. لە هەمان کاتا هەوڵم دەدا داوی خەیاڵم نە پچڕێ، تا بەتەواوەتی بیانژمێرم. بەجۆرێ لەم کارە راهاتم کە دوای چەند هەفتەیەك دەمتوانی چەندین سەعات بەو حاڵەوە بمێنم بێ ئەوەی جگە لە ژماردنی هەموو شتەکانی ناو ژوورەکەم بیر لە هیچ شتێکی دیکە بکەمەوە. بە مجۆرە هەرچی پتر بیرم دەکردەوە شتانی گوم و فەرامۆشکراوی زیاترم لە قوڵایی زەینمەوە دێنایە دەرێ. هەنگێ حاڵی بووم کە پیاوێك تەنیا یەك رۆژ ژیابێ دەتوانێ بە ئاسانی سەد دانە ساڵ لە زیندانا بژی. چونکە هێندەی بیرەوری لا کۆدەبێتەوە کە بێتاقەت نەبێ. ئەمە بۆخۆی جۆرە دەسکەوتێك بوو.

نارەحەتی خەوتنیش لە ئارادا بوو. لە سەرەتادا، شەوان باش نەدەخەوتم وبە رۆژەوە هەر نەدەخەوتم. وردە وردە شەوانم باشتر بوو و تەنانەت دەمتوانی بە رۆژیش بخەوم. راستییەکەی لەدوامانگەکاندا، شەوو رۆژی شانزە تا هەژدە سەعاتان دەخەوتم. تەنیا شەش سەعات دەمایەوە کە ئەویشم بە نانخواردن، پێشاو، وبە بیرەوەرییەکانم و سەربوری کابرا چیکۆسلۆفاکییەکە دەقەتاند.

له بەینی تەختەکەمو دۆشەکە ناواخن پوشەکەم دا پارچە رۆژنامەیەکی کۆنم دۆزییەوە کە تەقریبەن نووسابوو بە بەرگی دۆشەکەکەو، تەواو زەرد هەڵگەڕابوو و تەنك بووبووەوە. ئەمە سەربوریکی کورتی نادیاری دەگێڕایەوە کە هەوەڵەکەی گووم بووبوو، بەلام دیاربوو کە لە چیکۆسلۆفاکیا رووی دابوو. پیاوێك لە گوندێکی چیکەوە بەمەبەستی دەوڵەمەند بوون رۆیی بوو. دوای بیست و پێنج ساڵان، بە دەوڵەمەندی لەگەڵ ژنەکەی و منداڵێکا گەڕابووەوە. دایك و خوشکەکەی لە گوندەکەی زاگەی وی میوا نخانەیەکیان بەڕێوە دەبرد. بۆ غافلگیرکردنی وان، ژن و منداڵەکەی لە ئوتێلێکی دیکەدا دانابوو، و چوو بوو بۆ میوا نخانەکەی دایکی کە ئەمی نەناسیبووەوە. هەر بۆ خۆشی و شۆخی هاتبوو بە بیریا کە ژوورێك لەوێندەر بەکرێ بگرێ. پارەکەی پێ نیشاندابوون. دایك و خوشکەکەی، بەمەبەستی دزینی پارەکەی، شەوێ بە چەکوش کوشتبوویان و لاشەکەیان فڕێ دابووە روبارەوە. بەیانی ژنەکەی هاتبوو، وبێ ئەوەی ئاگای لە واریقاتەکان بێ، ناسنامەی رێبوارەکەی ئاشکرا کردبوو. ئیدی دایکەکە خۆی هەڵواسی بوو و خوشکەکەی خۆی خستبووە بیرەوە. ئەم سەربووەم هەزاران جار خوێندبووەوە. لە سەرێکەوە مەحاڵ بوو، بەلام لە سەرێکی دیکەوە ئاسایی بوو. بەڵێ هەستم کرد کە کابرای رێبوار تارادەیەك شایستەی ئەم چارەنووسە بوو. وهەرگیز نابێ شۆخی و تەمسیل بکرێ. بە مجۆرە وەختەکە بە خەو، بیرەوەری، خوێندنەوەی سەربورە چیرۆکەوانییەکەم و بە دووی یەکا هاتنی روناکی و تاریکی، دەبوری. لە شوێنێکا خوێندبوومەوە کە مرۆڤ لە دوائە نجامدا، لە زندانا چەمك و مانای زەمان لەدەست دەدا. بەلام ئەمە بەلای منەوە مانایەکی ئەوتۆی نەبوو. لەمە حاڵی نەبووبووم کە رۆژان چۆن لە هەمان کاتاهەم کورت دەبن و هەم درێژ. بی گومـــان بـــۆ ژیانکردن درێژ بوون، بەلام بە رادەیەك دەکشان کە لە ئە نجامدا بەسەر یەکدا دەرژان و ئاوێتەی یەکدی دەبوون. رۆژەکان لێرەدا ناوی خۆیان لە دەست دەدا. وشەی ((دوێنێ)) و ((سبەی)) تاقە وشەبوون کە بەلامەوە مانایەکیان هەبوو.

کاتێ کە رۆژێك پاسەوانەکە پێی گووتم کە پێنج مانگە لێرەم، باوەڕم پێکرد. بەلام لە ماناکەی حاڵی نەبووم. بەلای منەوە هەمووی هەر ئەو یەك رۆژەبوو کە لەناو زندانەکەمەوە درێژ دەبووەوەو هەمان ئەو کارەبوو کە پەیگیریم دەکرد. ئەو رۆژە کە پاسەوانەکە رۆیی لە تەشتۆکە ئاسنینەکەمدا تەمەشای خۆم کرد، وام هاتە بەر خەیاڵ کە وێنەکەم حاڵەتێکی جدی هەیە و تەنانەت کاتێ کە ویستم بەروویا پێ بکەنم هەر جدی بوو. تەشتۆکەکەم لە بەرانبەر خۆما جولاند. من پێکەنیم و ئەو هەر حاڵەتە جدی و غەمناکەکەی خۆی لەدەست نەدا. رۆژ لە تەواو بوونا بوو ئەو سەعاتە دەهاتە پێشێ کە نامەوێ باسی بکەم. ئەو سەعاتە بێ ناوەی کە سەدای خۆرنشین و شەو لە هەموو قاتەکانی زندانەکەوە بە ناو کاروانی بێدەنگی دا بەرز دەبووەوە. چووە بەر کلاو رۆژنەکە، لەبەر دواتیشکی روناکییەکەدا، جارێکی دیکە روانیمە وێنەکەی خۆم. وێنەکە هەر جدی بوو، ئە مجارەیان سەیر نەبوو چونکە بە خۆیشم هەمان حاڵەتم هەبوو. بەلام لە هەمان کاتدا و بۆ یەکەمین جار پاش تێپەڕبوونی چەندین مانگ، بەروونی گوێم لە ئاهەنگی دەنگی خۆم بوو. دەنگەکەم ناسییەوە، زانیم هەمان دەنگە کە رۆژگارێکی درێژ لە گوێمدا دەنگی دەدایەوە. ئەوسا حاڵی بووم کە هەموو ئەو کاتە بەتەنێ قسەم لەگەڵ خۆدا کردووە. هەنگێ گووتەی پەرستارەکەم لە کاتی بە خاکسپاردنی دایکما بیرکەوتەوە. نە، هیچ مەفەڕێك نەبوو. کەس ناتوانێ شەوانی زندان تەسەوربکات.

((٣))

ناتوانم بڵێم كە ئەو مانگانە درەنگ تێپەڕین، تەنیا ئەوەندە دەزانم بەر لەوەی یەكەمین هاوین تەواو بێ، هاوینێكی دیكە هاتەوەو جێی هاوینی یەكەمی گرتەوە. دەمزانی كە لەگەڵ بەرزبوونەوەی یەكەم گەرمادا، شتێكی تازەم لێدەقەومێ. دۆسییەكەم هەواڵەی دوا دەورەی دانیشتنی دادگا كرا. ئەم دەورەیە لە مانگی حوزەیرانا كۆتایی دەهات، ئەو ڕۆژەی كە دادگاییەكەی من دەستی پێكرد، لە دەرێ، هەموو شتێك نقومی هەتاو بوو. پارێزەرەكەم دڵنیای كردم كە ئەم دانیشتنانە پتر لە دوو یا سێ ڕۆژ ناخەیەنێ و لەسەری ڕۆیی: ((ئەمە زێدەباری ئەوەی كە دادگا پەلەیەتی. چونكە پرسەكەی تۆ گرنگترین پرسی ئەم دەورەیەی دانیشتنەكە نییە. لەدوای ئەوە یەكسەر دۆسییەی تاوانبارێكی بابكوژ دەخرێتە ڕوو.))

سەعات حەوت و نیوی بەیانی بە دوومدا هاتن. ئۆتومبیلی زندان بۆ هۆڵی دادگای بردم. دوو پۆلیس بردیانمە ژوورێكەوە كە بۆنی تاریكی لێدەهات. لە نزیكی دەرگایەكەوە بەدەم چاوەڕوانییەوە دانیشتین كە لەو دیوییەوە دەنگی هەراو زەناو گواستنەوەی كورسیان و هاتو چۆ دەهات و یادی جەژن و ئاهەنگەكانی گەڕەكی خۆمانی وەبیر دەهێنامەوە كە لەدوای تەواوبوونی ئاهەنگی گۆرانی و كۆنسێرت، كورسییەكانیان دەگواستەوە تا جێگە بۆ سەما كردن بكەنەوە. پۆلیسەكان پێیان گووتم دەبێ چاوەڕوانی ئەندامانی دادگا بین. ویەكێكیان جگەرەیەكی بۆ درێژ كردم كە وەرم نەگرت. دوای تۆزێك پرسی كە ((ئایا دەترسم)). وەڵامم دایەوە: ((نە)). تەنانەت لە سەرێكەوە پێم خۆش بوو كە دادگایەك ببینم. لە ژیانما هەرگیز دەرفەتی وەهام بۆ نەرەخسابوو. پۆلیسی دووەم گووتی: ((بەڵێ، بەلاَم لە دوا ئە نجاما بنیادەم ماندوو دەكات.))

دوای كەمێك زەنگێكی بچووك لە هۆڵەكەدا لێدرا. كەلەبچەكانیان لەدەستم كردەوە. دەرگاكەیان كردەوەو بردیانمە شوێنی تاوانباران. هۆڵەكە هێندە قەرەباڵغ بوو دەرزیت هەڵدابا نەدەكەوتە سەرزەوی. هەرچەند پەردەكان لانەبرابوون، هەتاو لە گۆشەو كەنارانەوە دەهاتە ژوورەوەو هەوای هۆڵەكە هەناسەی بنیادەمی تەنگ دەكرد. پە نجەرەكان داخرابوون. من دانیشتم و پۆلیسەكان دەوریان گرتم. لەم دەمەدا بوو كە ڕیزێك سیماو دەموچاوم لە بەرانبەر خۆما بینی. هەموویان تەمەشای منیان دەكرد، زانیم كە ئەمانە ئەندامانی دادگان. بەلاَم ناتوانم بڵێم كە چ جیاوازییەكیان لە یەكدی هەبوو. تەنیا هەستێكم لادروست بوو كە: من لەبەردەم تەختی تراموایەكدام و هەموو ئەم ڕێبوارە نەناسراوانە لە كەمینان بۆ تازە ڕێبوارێك تا بەوردی تەمەشای ئەداو ئەتواری پێكەنیناوی ئەو بكەن. هەڵبەتە دەمزانی كە ئەمە بەراوردێكی ساویلكانە بوو. چونكە ئەمانە، لێرەدا عەوداڵی تەمەشاكردنی تاوان بوون، نەك عەوداڵی ڕەفتارو ئەتواری پێكەنیناوی. لەگەڵ ئەمەشا جیاوازییەكە گەورە نەبوو. بەهەرحاڵ ئەمە بیرێك بوو كە بەزەینمدا هات.

بەهۆی قەرەباڵغییە زۆرەكەی ناو ئەم هۆڵە داخراوەوە كەمێك گێژ بووم. جارێكی دی تەمەشای هۆڵی دادگاكەم كردەوەو هیچ سیمایەكم جیا نەكردەوە. پێم وایە هەوەڵجار نەمزانی كە ئەم هەموو خەڵكە لە هەوڵی دیتنی مندان. لە ژیانما. ئەوەندە خەڵكە لە خەمی منا نەبوون. دەبوایە هەوڵبدەم تاوەكو تێ بگەم كە من هۆی ئەم هەموو هەراو هەنگامەیەم. بە پۆلیسەكەم گووت: ((چەند قەرەباڵغە!)) وەلاَمی دایەوە كە

هۆی ئەم قەرەباڵغییە رۆژنامەکانن، وژمارەیەکی پێ نیشاندام کە لە پشت مێزێکەوە لـە خـوار شـوێنەکەی ئەنــدامانی دادگــاوە دانیشــتبوون و گــووتی: ((ئەوانــەن)) پرســیم: ((کــێ؟))و دووبــارەی کــردەوە: ((رۆژنامەکان)). یەکێك لە رۆژنامە نووسەکانی دەناسی کە لەم کاتەدا ئێمەی بینی و بـەرەو لامـان هـات. پیاوێکی بەتەمەن بوو، گەرچی تۆزە گرژییەك بە دەمووچاوییەوە بوو، بەلاَم دەچووە دڵـەوە. زۆر بەگـەرمی دەستی پۆلیسەکەی گوشی. لەم دەمەدا، ملاحەزەم کرد کـە خەڵکەکـە کـاتێ یەکـدی دەبیـنن چـاك و خۆشـی دەکەن و پێکەوە قسە دەکەن، رێك وەکو ئەوکاتەی ئینسان لە یانەیەکدا خۆی لـە نێـو هاوشـانانی خۆیـدا دەبینێتەوە، خۆشحاڵ دەبـێ. حـاڵەتێکی غـەریب و سـەیر گرتمی، هەستم کـرد مـن لـە ناویانـدا زیـادەم، غەیارەم. لەگەڵ ئەمەشا رۆژنامە نووسەکە دەم بە پێکەنین، رووی کردە من و پێی گووتم هێڤیدارە دۆزەکەم بە دڵی خۆم بشکێتەوە. سوپاسم کرد و لەسەری رۆیی: (( دەزانی، ئێمە قەزییەکـەی تۆمـان کـەمێك گـەورە کردوەتەوە. هاوین وەرزی کەسادی بازاڕی رۆژنامانـە وجگـە لـە قەزییەکـەی تـۆ و تـاوانبـارە بابکوژەکـە چ شتێکی دیکەی شایانی باسمان نەبوو.)) ئەوجا لەناو ئەو دەستەیەی کە لای ئەوانەوە هاتبوو، کابرایـەکی ریوەڵەی رەقەڵەی نیشاندام کە لە سمۆرەیەکی قەڵەو دەچوو و عەینـەکێکی چوارچـێوە رەشـی لـە چـاوبوو. گوتی ئەم پیاوە نوێنەری تایبەتی یەکێك لە رۆژنامەکانی پاریسە: ((جا ئەو بۆ دۆزەکەی تـۆ نـەهاتووە. چونکە راسپێردراوە کە لە دادگـایی ئـەو تـاوانبـارە بـابکوژەدا بەشـداری بکـات، و لـە هـەمان کاتـدا داوای لێکراوە کە سەبارەت بە تۆش را پۆرێك ئامادە بکات.)) لێرەدا چی وای نەمابوو کە سوپاسی بکـەم. لێ بـیرم کردەوە کە ئەم سوپاسگوزارییە مایەی پێکەنین دەبێ. بە دەست ئاماژەیەکی دۆستانەی بۆ کردم و لێمان جیا بووەوە. چەند دەقیقەیەکی دی چاوەروا نمان کرد.

پارێزەرەکەم بە جلی فەرمییەوە لەگەڵ ژمارەیەك لـە هاوکارانیـدا وەژوور کـەوت. چـوو بـۆلای رۆژنامـە نووسەکان. دەستی گووشین. سوعبەتیان لەگەڵ یەکدیدا کرد. پێکەنین ، تەواو ئاسـودە دەهاتنـە بەرچـاو. تا ئەو کاتەی کە دەنگی زەنگ، لەلای مێزی ئەندامانی دادگاوە بەرز بـووەوە. هـەمووان لـە شـوێنی خۆیـان دانیشـتن. پارێزەرەکـەم هـات بـۆ لای مـن. دەسـتی گوشـیم و ئامۆژگـاری کـردم کـە بـەکورتی وەلاَمـی ئـەو پرسیارانە بدەمەوە کە لێم دەکرێن، لە قسە کردنا دەست پێشکەری نەکەم و باقی کارەکان بەو بسپێرم.

لای چە پمەوە دەنگی کورسییەکم گوێ لێ بوو کە رایـان دەکێشـاو شـوێن گۆرکێیـان پێـدەکرد. و پیـاوێکی لاوازی درێژی جل سـوورم بینـی کـە عەینـەکێکی تاکچـاوی لـە چـاو کردبـوو وبـە وریـایی چـمکی جلـەکانی کۆدەکردەوەو دادەنیشت. ئەمە دادوەر بوو. سکرتێری دادگا رەسمییەتی دانیشتنەکەی راگەیاند. لەم دەمـەدا دوو پانکەی گەورە کەوتنە خرەخر، و سێ قازی، دوانیان بەجلی رەش، سێیەمیان بەجی سوورەوە، دۆسـییە بەدەسـت وەژوورکـەوتن. و زۆر بـە پەلـە بـەرەو ئـەو مێـزە چـوون کـە بەسـەر هۆڵەکـەدا زاڵ بـوو. پیـاوە سوورپۆشەکە لەسەر کورسی ناوەڕاست دانیشت. کلاَوە فەرمییەکـەی لـە بـەردەم خۆیـدا دانـا. کەللـە بچـوکە روتاوەکەی خۆی بە دەستەسرێك سڕی و کردنەوەی دانیشتنەکەی راگەیاند.

رۆژنامە نووسەکان قەڵەمەکانیان بەدەستەوە گرت. سیمای هەموویان بێ مووبالات و هەندێ پێکەنیناوی بوو. کەچی یەکێکیان کـە لـەوانی دی گـە نجتر بـوو، بـە جلێکـی فلانیلـی کـەوەیی و بۆینبـاخێکی شینەوە، پاندانەکەی لەبەردەم خۆیدا دانابوو و تەمەشای منی دەکرد. لە سیماو چارەی هەنـدێ نارێکیـا، مـن چـاوە پڕشنگدارەکانیم دەبینی کە بەوردی نیگای منی دەکرد، بێ ئەوەی گوزارشت لـە شـتێکی دیـاری کـراو بکـەن.

هەستێکی سەیرم لا پەیدا بوو، ئەو هەستەی کە خۆم خەریکم سەیری خۆم دەکەم. رەنگە لەبەر ئەمە بووبێ، هەروەها لەبەر ئەوەی شارەزای عادەت و رێو رەسمی ئەوێندەر نەبووم، کە دروست حاڵەی نەبووم دواتر چی روویدا، نە قورعەکێشی قازییەکان، نە پرسیارەکانی سەرۆکی دادگا لە پارێزەرەکەم و لە دادسێن و لە ئەندامانی دادگا(( هەموو جارێك، سەری هەموو قازییەکان پێکەوە بەرەو لای سەرۆکی دادگا دەسوڕایەوە.))

خوێندنەوەی خێرای دەقی تاوانبارییەکە کە ناوی هەندێ شوێن و کەسانم تیادا ناسییەوە، وئەو پرسیارە تازانەی کە لە پارێزەرەکەم کران، هیچیان بە دروستی حاڵی نەبووم. ئەوجا سەرۆك گووتی نەو نۆرەی ئامادەبوونی شایەتەکانە. سکرتێرەکە هەندێ ناوی خوێندەوە کە مایەی سەرنجی من بوون. سەیرم کرد لە نێو ئەو ئاپورایەوە کە تا دەمێك لەوەپێش شێوەیەکی دیاری نەبوو، بەرێوەبەرو دەرگاوانی لەنگەرخانەکە، تۆماس پیرزی پیر، ریمۆن، ماسۆن، سالامانۆ و ماری یەك یەك هەستان و لە دەرگایەکی لاوەکییەوە وەدەرکەوتن. ماری سووکە ئاماژەیەکی هاوخەمی بۆ کردم. من تا ئەوکاتەی کە سیلست، کە دوا نەفەر بوو کە ناویان خوێندەوە، هەستا، پێم سەیر بوو کە چۆن تا نەو نەمدیتبوون. لە پاڵ ئەودا ژنە وردیلە زیتەڵەکەی ریستۆرانتەکەم ناسییەوە، هەمان چاکەتی لەبەردابوو، بەرقەوە نیگای دەکردم. من کاتی بیرکردنەوەم نەبوو. چونکە سەرۆك دەستی بە قسان کرد. گووتی: نەو دادگایی راستەقینە دەست پێدەکات و بە پێویستی نازانێ کە بەئامادەبووان بڵێ ئارام و بێدەنگ بن. بە باوەڕی ئەو بە رەچاوکرنی ئەم پرەنسیپە دەشێت دادگاییەك بەشێوەیەکی واقیعبینانەو بێلایەنانە بەرێوە ببرێ. حوکمی قازیانی دادگا بە گیانێکی داد پەروەرییەوە دەردەچێ. بەهەرحاڵ لەگەڵ بچووکترین پەشێوی دا تەمەشاڤانان دەکاتە دەرەوە.

گەرما زیادی دەکرد و دەمبینی لە هۆڵەکەدا، تەمەشاڤانان بە رۆژنامە خۆ باوەشێن دەکەن. خشەخشی بەردەوامی کاغەز هەڵدەستا. سەرۆك ئاماژەیەکی کردو سکرتێرەکە سێ باوەشێنی حەسیری هێنا کە سێ قازییەکە یەکسەر کەوتنە بەکارهێنانیان.

ئیدی لەودەمەوە پرس و جۆی من دەستی پێکرد. سەرۆك بەهێمنی، و بگرە وام هەست دەکرد کە میهرەبانە، دیسان پرسیاری ناسنامەیان لێکردم و وێرای نارەحەتی و تووڕەییم هەستم کرد کە لەراستیا ئەمە کارێکی زۆر ئاساییە. چونکە بۆ دادگا شورەیی بوو ئەگەر کەسێك لەبری کەسێکی دیکە دادگایی بکات. ئەوجا سەرۆك سەربردەی کارەکەی منی شرۆڤە کرد. و دوای خوێندنەوەی سێ ڕستەو جارێك لێی دەپرسیم: ((وایە؟)) منیش بەگوێرەی ئامۆژگاری پارێزەرەکەم، هەموو جارێ وەڵامم دەدایەوە: ((بەڵێ، جەنابی سەرۆك.)) ئەم کارە درێژەی کێشا. چونکە سەرۆك وردەکارییەکی زۆری تێهەڵکێشی قەزیەکە کردبوو. رۆژنامە نووسەکان بە درێژایی ئەم ماوەیە هەر دەیاننووسی. من هەستم بە نیگای هەرەگە نجەکەیان و ئەو ژنە زیتەڵەکە دەکرد. تەختی تراموایەکە بەتەواوەتی رووەو سەرۆك وەرچەرخابوو. سەرۆك کۆکەیەکی کرد، لاپەرەی دۆسییەکەی هەڵدایەوە، و بەدەم خۆباوەشێن کردنەوە، بۆ لای من ئاوڕی دایەوە. پێی گووتم ئێستا دەبێ هەندێ پرسیاران بکەین کە بەرواڵەت پەیوەندی بەقەزیەکەی منەوە نییە، بەلام لەوەیە پەیوەندی نزیکی پێوەی هەبێ. هەستم کرد کە دەیەوێ دیسان باسی دایکم بکات. و لەم دەمەدا هەستم کرد کە ئەم کارە چەند بێتاقەت و نارەحەتی دەکردم. لێی پرسیم بۆچی دایکم لە کەترەخانە دانابوو؟ وەڵامم

دایەوە چونکە پارەم نەبوو تا لای خۆم گلی بدەمەوەو خزمەتی بکەم. لێی پرسیم ئایا ئەم جوداییە کاری لە شەخسی من کردووە؟ وەڵامم دایەوە کە دایکم و من، چاوەڕوانی هیچ نە لەیەکترو نە لەکەسانی دیکە نەبووین و هەردووکمان خوومان بە ژیانی تازەمانەوە گرتبوو. هەنگێ سەرۆك گووتی نایەوێ زۆر لەسەر ئەم بابەتە بڕوات. ئەوجا لە دادستانی پرسی ئایا هیچ پرسیارێکی هەیە لەمن؟ دادستانەکە کە نیوەی پشتی لە من بوو، بێ ئەوەی نیگای من بکات، گووتی بەیارمەتی جەنابی سەرۆك، دەیەوێ بزانێ کە ئایا گەڕانەوەی من بە تاقی تەنیا بۆ سەر کانییەکە بە قەستی کوشتنی کابرای عەرەب بووە؟ گووتم: ((نە.)). ((چاکە، بۆچی چەکداربووەو لەبەرچی یەکڕاست بەرەو هەمان شوێنی دیاریکراو گەڕابووەوە؟)) گوتم بە ڕێکەوت بوو. دادستانەکە بەتەوسەوە گووتی: ((جارێ ئەوەندەمان بەسە.)) هەنگێ شتەکان کەمێك ئاڵۆزان، یان بەلای کەمەوە من وام هەستدەکرد. بەڵام دوای هەندێ چپە چپ و ڕاوێژان بەم وبەو، سەرۆك کۆتایی دانیشتنەکەی ڕاگەیاند و دانیشتنی پاش نیوەڕۆ بۆ گوێگرتن لە گەواهی شایەتەکان، تەرخان کرا. فریای بیرکردنەوە نەکەوتم. سواری ئۆتومبیلی زندانیان کردم وبۆ زندانەکەیان بردمەوە کە لەوێندەر نانم خوارد. پاش ماوەیەکی کورت هەر بەئەندازەی ئەوەی کە هەست بکەم ماندووم، هاتنەوە بە شوێنما. هەموو شتێك لە نوێ دەستی پێکردەوەو من خۆم لە هەمان هۆڵداو لە بەردەم هەمان ئەو سیمایانە بینییەوە. بەلام دنیا زۆر گەرمتر بووبوو، هەموو قازییەکان و دادستان و پارێزەرەکەی من و چەند ڕۆژنامەنووسێکیش باوەشێنیان بەدەستەوە بوو، لەتۆ وایە بە موعجیزەیەك ئەمە کراوە. ڕۆژنامەنووسە گەنجەکەو ئەو ژنە زیتەڵەیەش لە جێی خۆیان دانیشتبوون، بەڵام ئەمانە خۆیان باوەشێن نەدەکردو خامۆش و بێدەنگ، تەمەشای منیان دەکرد.

ئارەقەکەی دەموچاوم سڕی و تەنیا کاتێ وەئاگا هاتمەوەو زانیم لە کوێم کە گوێم لێ بوو بەرێوەبەری لەنگەرخانەکەیان گاز کردو لێیان پرسی کە ئایا دایکم گلەیی لەمن هەبووە؟ وەڵامی دایەوە بەڵێ، ئەمە عادەتی کەسانی ناو کەترەخانەکە بوو کە سکاڵا لە کەس وکاریان بکەن. سەرۆك داوای لێکرد روونتر قسە بکات کە ئایا دایکم سکالای ئەوەی لێدەکردم کە لە کەترەخانە دامنابوو؟ و بەرێوەبەر هەمدیس گووتی بەڵێ. بەڵام ئەمجارەیان هیچی تری نەگووت. وەڵامی پرسیارێکی دیکەی دایەوە کە گوایە لە هێمنی و ئارامی من، لە ڕۆژی ناشتنی دایکمدا، سەری سوڕمابووە. پرسیاری لێکرا مەبەستی ئەو لە هێمنی و ئارمی چییە؟ هەنگێ بەرێوەبەر چاوی بڕییە نوکی پێلاوەکانی، و گووتی لەو ڕۆژەدا من نەم ویستبوو دایکم ببینم و تەنانەت بۆ تاقە جارێکیش نەگریابووم، و پاش ناشتنەکە بێ ئەوەی بەدیار گۆڕەکەیەوە ڕا بمێنم یەکسەر گەڕابوومەوە. شتێکی دیکەش ئەوی سەرسام کردبوو: یەکێك لە مامورانی ناشتنەکە بەوی گوتبوو کە من تەمەنی دایکم نەدەزانی. بۆ ساتێك بێدەنگی بەرقەرار بوو. وسەرۆك لەوی پرسی ئایا ئەو قسانەی کە کردنی بەڕاستی دەربارەی منە؟ لەبەر ئەوەی بەرێوەبەر لە پرسیارەکە حاڵی نەبوو، سەرۆك پێی گووت: ((ئەمە یاسایە.)) ئەوجا سەرۆك لە دادستانی پرسی ئایا هیچ پرسیارێکی لە شایەدەکە هەیە؟ و دادستانەکە هاواری کرد: (( نەخێر ئەوەندە بەسە.)) و ئەم ڕستەیەی هێندە بە خرۆشەوە و هێندە بە نیگایەکی سەرکەوتوانەوە ڕووەو من گووت، کە بۆ یەکەمین جار دوای چەندین ساڵ، ئارەزوویەکی گەوجانەی گریان گرتمی. چونکە هەستم کرد کە تا چ رادەیەك مایەی نەفرەت و بێزاری ئەو خەڵکانەی ئەوێندەرم.

سەرۆك لە قازییەكان و لە پارێزەرەكەمی پرسی كە ئایا پرسیاریان نییە. دەرگاوانی كەترەخانەكەی گاز كرد. سەبارەت بەویش وەكو خەڵكانی دی هەمان تەشریفات دووبارە بووەوە. دەرگاوانەكە كە هات نیگایەكی منی كردو چاوانی خۆی وەرگێڕا. وەڵامی ئەو پرسیارانەی دایەوە كە لێی كران. گووتی كە من نەمویستبوو دایكم بدینم. و جگەرەم كێشابوو و خەوتبووم و دواجار شیرو قاوەم خواردبووەوە. لەم كاتەدا هەستم كرد كە شتێك هەموو هۆڵەكەی هاروژاند. و بۆ یەكە مجار زانیم كەمتەرخەم بووم. دەرگاوانەكەیان والێكرد مەسەلەی شیرو قاوەكەو جگەرەكێشانەكە دووبارە بكاتەوە. دادستان بە نیگایەكی پڕ لە پڕشنگی تەوسەوە تێی روانیم. لەم دەمەدا پارێزەرەكەم لە دەرگاوانەكەی پرسی ئایا ئەو لەگەڵ منا جگەرەی نەكێشابوو؟ بەڵام دادستانەكە بە توندی دژی ئەم پرسیارە وەستایەوەو گووتی: ((تاوانبار لێرەدا كێیە؟)) ئەم رێبازی بوختان كردنە بە شایەدان لە پای چی؟ بەم بوختانانە دەیانەوێ لە گرنگی ئەو شایەتیانە كەم بكەنەوە كە بە هەموو حاڵ و حیسابێك شایەتی بنجبڕو سەلمێنەری تاوانەكەن.)) وێرای ئەمەش دادستان داوای لە دەرگاوانەكە كرد كە وەڵامی پرسیارەكە بداتەوە. پیرەمێرد بە پەشۆكاوی گووتی: (( من چاك دەزانم كە هەڵەم كرد. بەڵام دڵم نەهات جگەرەكەی ئاغا رەت بكەمەوە.)) لێرەدا لە منیان پرسی ئایا شتێكی زیاترم هەیە بیڵێم. وەڵامم دایەوە: ((هیچم نییە تەنیا ئەوەنەبێ كە بڵێم شایەدەكە راست دەكات. راستە من جگەرەم دایێ.)) هەنگێ دەرگاوانەكە بە كەمێك سەرسامی ئاوێتە بە سوپاسگوزاری نیگای كردم. كەمێك پەشۆكاو وئەوجا گووتی كە ئەو قاوەو شیری بە من دابوو. پارێزەرەكەم وەكو ئەوەی فە تحێكی گەورەی كردبێ، بە هات و هاوارەوە رایگەیاند كە ئەندامانی دادگا ئەم خاڵە رەچاو دەكەن. بەڵام دادستان لە سەرومانەوە هاواری كرد و گووتی: ((بەڵێ ئەندامانی دادگا رەچاوی دەكەن و ئەو ئە نجامگیرییە دەكەن كە پیاوێكی بێگانە دەتوانێ قاوە پێشكەش بكات، بەڵام كوڕێك لە بەردەم جەنازەی كەسێكدا كە بوون وژیانی پێ بەخشیوە، دەبێ ئەوە رەفز بكات.)) دەرگاوانەكە گەڕایەوەو لەسەر تەختەكەی خۆی دانیشتەوە.

كە نۆرە هاتە سەر تۆماس پیرز، دەبوو دەرگاوانێك دەستی بگرێ تا بیگەیەنێتە محەجەرەكە. پیرز گووتی تەنیا دایكمی دەناسی و منی تەنیا جارێك، ئەویش لە رۆژی ناشتنەكەدا دیتووە. پرسیاری لێكرا كە من لەو رۆژەدا چیم دەكرد. وەڵامی دایەوە: (( من بە خۆم لەو رۆژەدا یەجگار خەمباربووم، حاڵی هەن. لەبەر ئەمە هیچم نەبینی. خەم و پەژارە بەری چاویان گرتبووم، هیچم نەدەبینی، چونكە ئەم رووداوە بۆ من خەمێكی زۆر گەورە بوو. تەنانەت بورامەوە. بۆیە نەمتوانی ئاغا بدینم.)) دادستانەكە لێی پرسی: ئاخۆ بەلای كەمەوە منی بینیوە كە بگریم. پیرز وەڵامی دایەوە نە. هەنگێ دادستانەكە گووتی: ((ئاغایانی قازی ئەم خاڵە رەچاو دەكەن.)) بەڵام ئەوقاتەكە تورە بوو. بە دەنگێك كە موبالەغە ئامێز هاتە بەرچاوم لە پیرزی پرسی: (( ئایا دیتبووی كە من نەگریم.)) پیرز گووتی(( نە )). وخەڵكەكە پێكەنین. پارێزرەكەم بەدەم هەڵكردنی قۆڵێكییەوە بە دەنگێكی بنجبڕ گووتی: ((ئەمە بە ماهییەتی ئەم دادگاییە هەموو شتێك راستەو هیچ شتێك راست نییە!)) دادستان ئەم قسەیەی پشت گوێ خست، و بە نووكی قەڵەمێك، عینوانی دۆسییەكای كون دەكردو بە رواڵەت خەمساردو بێموبالات دەینواند.

دوای پشوویەكی پێنج دەقیقەیی كە پارێزەرەكەم لەو ماوەیەدا پێی گووتم هەموو شتەكان خەریكە بە باشی دەچنە پێشێ، سیلست-یان بانگ كرد كە وەكو شایەتی بەرگری بۆ دادگا هێنابوویان. مەبەست

بەرگری لە من بوو. سیلست جارجارێ تەمەشایەکی لای منی دەکردو کڵاوە حەسیریەکەی بەدەستییەوە با دەدا، ئەو جلە نوێیەی لەبەر بوو کە هەندێ یەکشەمووان لەبەری دەکرد و لەگەڵ مندا بۆ جریدبازی ئەسپان دەهات. بەڵام پێم وایە نەیتوانی بوو بۆینباخ ببەستێ چونکە تەنیا یەك دوگمەی مسین یەخەی کراسەکەی دادەخست. لێیان پرسی ئایا من مشتەری ئەوبووم؟ و گووتی: ((بەڵێ، جگە لەمە دۆستیشم بوو.)) لێیان پرسی رای دەربارەی من چییە وەڵامی دایەوە کە من پیاو بووم. لێیان پرسی مەبەستی لەم قسەیە چییە وەڵامی دایەوە هەموو کەسێك مانای ئەم قسەیە دەزانێ. لێیان پرسی ئایا من بنیادەمێکی مەنگ و کەم دووبووم؟ وەڵامی دایەوە ئەوەی ئەو زانیویەتی کە من تەنیا کاتێ قسە دەکەم کە قسەیەکم پێ بێ. دادستانەکە لێی پرسی ئایا من بە رێك و پێکی پارەی خواردنەکانم دەدا؟ سیلست پێکەنی و گووتی: ((ئەمانە وردەشتی بەینی خۆمان بوو)). لێیان پرسی رای دەرهەق بە تاوانەکەی من چییە. لەم دەمەدا دەستی بە محەجەرەکەوە گرت و پێدەچوو پێشوەختە شتێکی ئامادە کردبێ، گووتی: ((بەڕای من ئەمە روداوێکی چاوەروان نەکراوبوو، یان دەشێت بگوترێ بەلایەکی ناگەهانی بوو. بەلایەك کە بنیادەم دەرەقەتی نایەت.)) دەیویست درێژە بە قسەکانی بدات بەڵام سەرۆکی دادگا پێی گووت زۆر باشە، بەسە، سوپاس. هەنگێ سیلست کەمێك داماو گووتی هێشتا قسەی ماوە. داوایان لێکرد کورتی بکاتەوە. هەمدیس دووبارەی کردەوە کە ئەمە بەلایەکی ناگەهای بوو. رووداوێکی چاوەروان نەکرابوو. و سەرۆکی دادگا گووتی: ((بەڵێ بەڵگە نەویستە لێ ئێمە بۆیە لێرە کۆدەبینەوە تا دەربارەی ئەم جۆرە رووداوانە بە گوێرەی قانون داوەری بکەین، دەتوانی دانیشیت.)) هەنگێ سیلست کە پێدەچوو زانیاری و چاکە خوازییەکانی تەواو بووبێ، ئاوڕێکی لای منی دایەوە. وام هاتە بەرچاو کە چاوەکانی دەبریقێنەوەو لێوەکانی دەلەرزن: وەکو ئەوە بوو کە بەمن بڵێ: لەوەی پتر چم لەدەست دەهات؟ من هیچم نەگووت. وهیچ رەفتارێکم نەنواند، بەڵام بۆ یەکە مجار لە ژیانما حەزم کرد پیاوێك لە ئامێز بگرم و ماچی بکەم. سەرۆك دیسان ئەمری پێکرد کە محەجەرەکە بەجێ بێڵێ. سیلست رۆیی و لە شوێنی شایەتەکان دانیشت. بە درێژایی کاتی دادگاییەکە هەر لەوێندەر دانیشتبوو. خۆی کەمێك بە پێشا دانەواندبووەوە، ئانیشکەکانی نابوونە سەر زرانییەکانی و کڵاوە حەسیرییەکەی بە دەستەوە بوو. گوێی لە هەموو ئەو قسانە دەگرت کە دەکران.

ماری وەژوورکەوت. کڵاوێکی لەسەر بوو و هێشتا هەر جوان بوو. بەڵام من بەقژی رووتەوە پترم خۆش دەویست و لەو شوێنەوە کە لێی دانیشتبووم بارستایی ناسکی مەمکەکانیم دەبینی، و هەروەها لێوی خوارەوەی کە هەمیشە تۆزێك ئاوسا بوو و هەمیشە منی فریو دەدا. زۆر تورە دیار بوو، هەوەڵجار پرسیاری لێکرد کە لەکەیەوە منی ناسیوە. باسی ئەو زەمانەی کرد کە لە دایەرەی ئێمەدا کاری دەکرد. سەرۆکی دادگا ویستی بزانێ کە پەیوەندی لە گەڵ منا چۆن بووە. ماری گووتی کە هاورێی من بووە. لە وەڵامی پرسیارێکی دیدا گووتی: راستە قەرار بوو ببمە ژنی. دادستانەکە کە دۆسییەکی هەڵدەدایەوە، لەنکاو لێی پرسی پەیوەندی ئێمە لە چ رۆژێکەوە دەستی پێکردبوو. ماری رۆژەکەی گووت. دادستانەکە بە ساردییەوە گووتی وابزانێ کە ئەم رۆژە یەکەم رۆژی دوای مردنی دایکی منە. ئەوجا بەتەوسەوە گووتی هەرچەند نایەوێ پێ لەسەر ئەم خاڵە ناسکە دابگرێ چونکە هەست بە نارەحەتی و ختوکەدانی بیرەوەرییەکانی ماری دەکات و لێی دەگات، بەڵام (لێرەدا تۆنی قسەکەی زۆر توند بوو) ئەرکی سەرشانی وای لێدەخوازێ کە گوێ بە هەلو

مەرجی ئەدەب نەدات. هەنگێ داوای لە ماری کرد کورتەی رووداوەکانی ئەو رۆژەی کە لە نزیکەوە منی ناسی، بگێڕێتەوە. ماری نەیدەویست قسە بکات. بەلاّم لە ژێر گوشاری دادستانەکەدا چیرۆکی مەلەکردنەکەمان و چوونە سینەماو گەڕانەوەمانی بۆ ماڵەکەی من باس کرد. دادستانەکە گووتی دوای ئیفادەکانی ماری لەبەردەم دادگا، لە بەرنامەکانی سینەمای ئەو رۆژە تەواو وردبووەتەوە. و ئەوجا لەسەری رۆیی کە ماری بەخۆی پێمان دەڵێت کە لەو کاتەدا چ فیلمێك پیشاندەدرا. ماری بە دەنگێکی مەیلەو روون گووتی کە فیلمێکی فرناندل بوو. کاتێ کە ئەو قسەکانی تەواو کرد بێدەنگییەکی تەواو باڵی بەسەر هۆڵەکەد کێشا. هەنگێ دادستانەکە بە ویقارێکی زۆرەوە هەستاو بەدەنگێکی پڕ لە هەڵچوونەوە، لە حاڵێکا کە قامکی بەرەو من درێژ کردبوو، بەکاوەخۆو وشە بەوشە دەستی بە قسان کرد: (( ئاغایانی قازی! ئەم پیاوە رۆژی دوای مردنی دایکی، بۆ مەلەوانی دەچێت بۆ کەنار، پەیوەندی ناڕەوا لەگەڵ ژنێکدا دەست پێ دەکات. و هەر بۆ پێکەنین دەچێتە فیلمێکی کۆمیدی و پێکەنیناوی. چ شتێکی ترم نییە پێتانی بڵێم. )) ودانیشت. بێدەنگییەکە بە هەمان دەقەوە بەردەوام بوو. بەلاّم لە پڕ ماری لەسەلای گریانی داو گووتی وانییەو شتی دیکە لەئارادایە و ناچاریان کردووە کە بە پێچەوانەی بیری خۆیەوە قسە بکات، ومن باش دەناسێت و من هیچ کارێکی خراپم نەکردووە. بەلاّم دەرگاوانەکە، بە ئاماژەیەکی سەرۆکی دادگا ماری بردە دەرێ و دادگاییەکە بەردەوام بوو. ئەوجا دەنگی ماسۆن هات کە دەگووت من پیاوێکی ئابڕومەند بووم، و بگرە کوڕێکی مەندو کەم دوو بووم. )) هەڵبەتە هیچ کەسێك گوێی نەدایێ. هەروەها کەس گوێی بە سالامانۆش نەدا کە دەیگووت من هەڵس و کەوتم لەگەڵ سەگەکەیا باش بووە. و لە وەلاّمی پرسیارێکدا سەبارەت بەمن و دایکم گووتی کە من هیچ قسەیەکم پێ نەبوو لەگەڵ دایکما بیکەم، لەبەر ئەوە لە کەترەخانەم دانابوو. سالامانۆ دەیگووت: (( دەبێ تێبگەن، پێویستە تێبگەن. )) بەلاّم پێناچوو چ کەسێك تێبگات. و کرایە دەرەوە. ئەوجا نۆرە هاتە سەر ریمۆن کە دوا شایەد بوو. ریمۆن سوکە ئاماژەیەکی بۆ من کردو یەکسەر گووتی کە من بێگوناح بووم، بەلاّم سەرۆك گووتی تاوانباری یا بێتاوانی منیان لەو ناوێ، بەڵکو باسکردنی رووداوەکەی لێدە پرسن. سەرۆك داوای لێکرد کە سەبر بکات تا پرسیاری لێدەکەن ئەوجا وەلاّم بداتەوە. داوایان لێکرد کە پەیوەندی خۆی لەگەڵ کوژراوەکەدا رون بکاتەوە. ریمۆن ئەمەی بە هەلزانی و گووتی پاش ئەوەی زللەیەکی لە خوشکی کوژراوەکە دابوو، ئیدی کوژراوەکە رق و کینەی لێ هەڵگرتبوو. لەگەڵ ئەمەشا، سەرۆك لێی پرسی کە ئایا دژمنایەتی کوژراوەکە دەرهەق بە من هۆیەکی هەبووە. ریمۆن گووتی بوونی من لە کەناری دەریا تەنیا رێکەوت بوو. هەنگێ دادستان لێی پرسی، ئەدی چۆن ئەو نامەیەی کە سەرچاوەی ئەم رووداوەیە لەلایەن منەوە نووسرابوو. ریمۆن وەلاّمی دایەوە ئەمەش رێکەوت بوو و دادستانەکە گەییە ئەو ئە نجامگیرییەی کە تا نهۆ رێکەوت لەم رووداوەدا کارێکی شوم و خراپی کردۆتەسەر هەست و هوشیاری. و ویستی بزانێ کاتێ کە ریمۆن توقاتی لە ماشوقەکەی دابوو، ئایا رێکەوت بووە کە من دەخالتم نەکردبوو؟ ئایا رێکەوت بووە کە لە پۆلیسخانەدا بە قازانجی ئەو شایەتیم دابوو؟ و هەروەها ئایا رێکەوت بووە کە لەو شایەتییەدا مجامەلەم کردووە؟ لە کۆتاییدا لە ریمۆنی پرسی کە چۆن دەژی و کە ریمۆن لە وەلاّما گووتی دوکاندارە، دادستانەکە بە قازییەکامنی راگەیاند کە لە نێو خەڵکیدا وەها باوە کە کاری ئەم شایەدە گەوادییە. و منیش شەریکی تاوان ودۆستی ئەو بووم. و لێرەدا سەروکارمان لەگەڵ یەکێك لە نزمترین جۆرە رووداوی نەنگینە، ئەمە جگە لەوەی

لەمبارەیەوە لە رووی ئەخلاقییەوە، روو بـەرووی بنیـادەمێکی شـەیتان سیفەتین. ریمـۆن ویسـتی بـەرگری بکات و پارێزەرەکەم ئیعترازی گرت. پێیان گووتن کە دەبێ رێگە بدەن دادستان قسـەی خـۆی تـەواو بکـات. دادستان گووتی: (( چ شتێکی وا نەماوە )) و لە ریمـۆنی پرسـی: (( ئایـا ئـەو دۆسـتی تـۆ بـوو؟ )) وەڵامـی دایەوە: (( بەڵێ، هاوڕێم بوو. )) هەنگێ دادستان هەمان پرساری لە من کـرد و مـن تەمەشـایەکی ریمـۆنم کرد کە هێشـتا نیگـای لـە مـن نەگواسـتبووەوە. و وەڵامـم دایـەوە: (( بـەڵێ )) ئەوسـا دادسـتان رووی کـردە ئەندامانی دادگاو گووتی: (( هەمان ئەو پیاوەی کە رۆژی پاش مردنـی دایکـی، دەسـت دەداتـە نـەنگینترین پەیوەندی نارەوا، بە بێ هۆو بەمەبەستی یەکلایی کردنەوەی رووداوێکی بێ ناموسیی لە گـووتن نـەهاتوو، پیاوێکی کوشتووە. ))

ئەوسا دانیشت. بەڵام پارێزەرەکەم کە کاسـەی سـەبری سـەررێژ بووبـوو دەسـتی خـۆی بـەرزکردەوە، بـە جۆرێ کە قۆڵەکانی داخزین و چینی کراسە ئاهارییەکەی بە دیارکەوت، وهاواری کـرد: (( نـەمانزانی ئایـا ئەو بەوە تـاوانبارە کە دایکی ناشـتووە یـا بـەوەی کـە پیـاوێکی کوشـتووە؟ ))و خەڵکەکـە پێکـەنین. بـەڵام دادستانەکە دیسان هەسـتا. چرچـی جبەکـەی سـاف کـردو گـووتی: مـرۆڤ دەبـێ بـە قـەد جـەنابی پـارێزەر ساویلکەبێ تـا بەستەگی قووڵ و پڕ سوێ وزەروری ئەم دوو بـابەتە حاڵی نەبێ. بە هەموو هێزییەوە هاواری کرد: (( بەڵێ ، من ئەم پیاوە بەوە تـاوانبار دەکەم کـە بـە دڵ ودەروونـی کەسێکی تـاوانکـارەوە دایکـی بـە خاك سپاردووە. )) وادیار بوو کە ئەم قسەیە کـارێکی زۆری کـردە سـەر ئـاپوراکـە. پارێزەرەکـەم شـانەکانی هەڵتەکاند و ئەو ئارەقەیەی کە نیشتبووە سەر تەوێڵی سڕی و وا دەهاتە بەرچاو کە بۆڕی خواردووە و ئیدی من حاڵی بووم کە رەوتی کارەکان بە قازا نجی من نارِوات.

دانیشتنی دادگاییەکە هەڵگیرا. کاتێ کە لە تەلاری دادگا ها تمە دەرێ تـا سواری ئۆتومبیلی زندان بـبم، بۆ ساتێکی کورت خایەن، رەنگو بۆی شەوی هاوینم لە درزی دەرگاکانەوە هەست پێکرد. لە تـاریکـایی ژوورە بزۆزەکەمەوە، لە قوڵایی مێشکی ماندوومەوە، هەموو دەنگە ئاشناکانی شـارێکم لا زنـدوو بـووەوە، شـارێك کە خۆشم دەویست، کات و ساتێ کە زۆربـەی کـات تیایـدا خۆشـحاڵ بـووم دووبـارە لام بەرجەسـتە بـووەوە. هاواری رۆژنامە فرۆشان لە هەوای فێنکدا، دوا بـاڵندانی مەیدانەکە، جاڕی سەندەویچ فرۆشان، نەڕەنـەڕی تراموایان لە پێچە هەورازەکانی شاردا، زەمزەمەی ئـاسمان بەرلەوەی شـەو بـاڵ بەسـەر بەنـدەرا بکێشـێت، هەر هەموو ئەمانە بۆ من رێك زناکی کوێران بوون، کە بەر لەچوونە زندانم ، بەباشـی دەمناسـین. بـەڵێ ، ئەمە ئەو سـەعاتە بـوو کـە جـارانی زۆر پـێش ئێسـتا تیایـدا شـادمان بـووم. ئـەو شـتەی کـە ئەوسـا لـەم سەعاتەدا چاوەڕوان بووم، هەمیشە خەوێکی سووك و بێ خەون بـوو. بـەڵام لەگـەڵ هـەموو ئەمەشـا شـتێك گۆڕابوو. چونکە لە چاوەڕوانی سبەینێدا تەنیا ژووری زندانەکەم بوو کـە دەیگرتمـە خـۆی. وەك بڵێـی ئـەو جادە ئاشنایانەی کە لە ئـاسمانی هاویندا رەسم کرابوون دەیـانتوانی بـە شـێوەیەکی یەکسـان هـەم بگەنـە خەوی بێگەرد، و هەم بگەنە زندان.

((٤))

تەنانەت لەسەر کورسی تـاوانبارانیش دا مایـەی سـەرنجە کـە مـرۆڤ گـوێ لەقسـەی کەسـانی دی بگـرێ دەربارەی خۆی. دەتوانم بڵێم لە قسەکانی دادستان و پارێزەرەکەما لەڕاستیدا زیاتر دەربـارەی شـەخی مـن

قسه کرا تا دەربارەی تاوانەکەم. ئایا ئەم قسەو گەنگەشانە زۆر لێکدی جیاواز بوون؟ پارێزەرەکە دەستی هەڵدەبڕی ووەکو تاوانبارێك بەرگری لێدەکردم و داوای بەخشینی بۆ دەکردم. دادستانەکە دەستی درێژ دەکردو تاوانباری منی رادەگەیاند، بێ ئەوەی داوای بەخشینم بۆ بکات، لەگەڵ ئەمەشا شتێك بەشێوەیەکی نادیارو ئاڵۆز نارەحەتی دەکردم، وێڕای جە نجاڵی بیرم، زۆر جار بەسەرما دەهات کە قسەیەك بکەم. لێ پارێزەرەکەم لەوکاتەدا دەیگووت: ((بێدەنگ بە، بێدەنگی زیاتر بە قازا نجی تۆیە.)) لەوە دەچوو کە کاری دادگاییەکە لە دەرێی بوونی مندا حەل وفەسڵ بکەن وهەموو شتێك بەبێ تەدەخولی من بەرێوە دەچوو. بەبێ ئەوەی پرسێك بەمن بکەن یان ڕایەکم وەربگرن، چارەنووسی من دیاری دەکرا. جارجاریٚ لە کەللەی دەدام کە قسەی هەمووان ببڕم و بڵێم: ((بەهەرحاڵ کێ تاوانبارە؟ تاوانباربوون مەسەلەیەکی گرنگە. ومنیش قسانم هەیە کە پێویستە بیکەم!)) لێ کە بیرم دەکردەوە دەمبینی هیچم پێ نییە بیڵێم. ئەمە جگە لەوەی کە دەبێ ئیعتراف بکەم کە ئەو کەیفەی پیاو لە مژولکردنی خەڵکی بە خۆوە دەیبینێ، زۆر ناخایەنێ. بۆ نموونە مرافەعەکانی دادستان زۆر زوو بێتاقەتیان کردم. تەنیا هەندێ برگە یا رەفتار یا هەندێ ڕستەی تەواو کە لە کۆی قسەکانی جیابوون، سەرنجیان رادەکێشام یان دەیانهاڕوژاندم.

ئەگەر بە هەڵە نەچووبم، بنەمای بیرکردنەوەی دادستانەکە ئەمە بوو کە من تاوانەکەم بە ئانقەست ئە نجام دابوو. یان بەلای کەمەوە هەوڵی دەدا ئەوە بسەلمێنێ. وەکو خۆی دەیگووت: ((ئاغایان بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونەم نەك بەڵگەیەك بەڵکو دوو بەڵگەی بتەوم بەدەستەوەیە. یەکەم لەبەر رۆشنایی ئاشکراو بێ چەندو چوونی ڕووداوەکان و دووەم لەبەر ئەو رۆشناییە لێڵەی کە دەرونی ئەم رۆحە تاوانکارە بۆمی فەراهەم دەکات.)) ئەوجا هەموو ڕووداوەکانی لە دوای مەرگی دایکمەوە بە کورتی گێڕایەوە. ئەمجارەش بێ موبالاتی و خەمساردی من، بێ ئاگاییم لە تەمەنی دایکم، چوونە مەلەوانیم لە رۆژی پاش مردنی دایکم، ئەویش لەگەڵ ژنێکا، سینەمای فرناندل و دواجار گەڕانەوەمی لەگەڵ ماری دا بۆ ماڵەوە دووبارە کردەوە.

لەم دەمەدا ماوەیەك بیرم کردەوە تا لە قسەکەی حاڵی بم. چونکە سەبارەت بە ماری دەیگووت: ((ماشوقەکەی))و بەلای منەوە ماری تەنیا ماری بوو. ئەوجا یەکسەر هاتە سەر باسی ریمۆن، و ئیدی زانیم کە تێگەییشتنی بۆ ڕووداوەکان لە ڕونی و ڕاستی بەدەر نییە. ئەوەی ئەو دەیگووت لە ڕاستییەوە نزیك بوو. من لەگەڵ ریمۆندا نامەیەکم نووسی بوو تا ماشوقەکەی فریوو بدەم و تەسلیم بە بەدرەفتاری کابایەکی(( ئەخلاق گوماناوی.)) بکەم. لە کەناری دەریادا ڕەقیبەکەی ریمۆنم هاڕوژاندبوو، ریمۆن زامدار بوو بوو ومن دەمانچەکەیم بردبوو و بەتاقی تەنیا گەڕابوومەوە تا بەکاری بێنم. وەکو چۆن پێشتر نەخشەم بۆ کێشابوو گوللەیەکم بەکابرای عەرەبەوە نابوو: چاوەڕوانم کردبوو و(( هەر بۆ دڵنیابوون لەوەی کە کارەکە بەباشی ئە نجام دراوە)) هەمدیس بەکاوەخۆو بەوردی و بە هوشیارییەوە چوار گوللەی دیکەم تیا خاڵی کردبووەوە.

دادستانەکە گووتی: ((فەرموون ئاغایان م لەبەردەم ئێوەدا باسی ئەو زنجیرە ڕووداوانەم کرد کە ئەم پیاوەیان بە هوشیارییەوە بەرەو قەتڵ بردووە- وگووتی- من جەخت لەسەر ئەم مەسەلەیە دەکەمەوە. چونکە لێرەدا باس باسی تاوانێکی ئاسایی یا کارێکی لائیرادی نییە، کە ئەنگۆ بتوانن حیسابی کاریگەریی

وەزع و حاڵەکانی بۆ بکەن، ئەم پیاوە زیرەکە، هوشیارە، گوێتـان لـە قسـەکانی بـووە، وانییـە؟ دەزانـیٚ چ وەڵامێك بداتەوە. بایەخی پەیڤان دەزانیٚ و ناشێت بگوترێ بێ ئاگایانەو بێ مەبەست ئەو کارەی ئـە نجام داوە.))

من گوێم دەگرت و گوێم لێ بوو کە بەزیرەك و هوشیارم دەزانـن. بـەلاٚم بـاش حـاڵی نـەدەبووم کـە چـۆن دەشێت خەسڵەتی کەسێکی ئاسایی بە بارێکی قورس بۆ تاوانبارێك بێتە ژماردن. بەهەر حـاڵ ئـەم بابەتـە پەستی کردم و ئیدی گوێم لە دادستانەکە نەگرت تا ئەو دەمـەی کـە گـوێم لێ بـوو دەیگـووت: ((ئـایـا هـیچ پەشیمانییەکی دەربڕیوە؟ هەرگیز ئاغایان! بە درێژایی ماوەی تەحقیقەکە تەنانەت تاقە جارێکیش ئـەم شەخسە سووی لە تاوانە چەپەڵەکەی خۆی نەخواردووە.)) لەم ساتەدا، لـە کاتێکـا کـە درێـژەی بـە قسـە ناخۆشەکانی خۆی، کـە لەراسـتیا هۆیەکـەیم نـەدەزانی، دەدا، بـۆ لای مـن وەرسـوڕاو قـامکی بـۆ ڕاکێشـام. هەڵبەتە ناچاربووم کە هەق بەو بدەم. من زۆر لـەو کـارەی کـە کردبـووم ژێـوان نـەبووم. بـەلاٚم سـەرم لـەم هەموو کەرەب و کینەکێشییە سوڕ دەما. حەزم دەکرد دۆستانەو بگرە دڵسۆزانە ئەوەی بۆ روونبکەمـەوە کـەتا نهۆ هەرگیز نەمتوانیوە لە هیچ شتێك ژێوان ببمەوەو سـووی لێ بخـۆم. مـن هەمیشـە بایـەخم بـەوەداوە کـە روودەدا، ئەمرۆ بێ یا سبەی. بەلاٚم هەڵبەتە بـەو وەزع و حاڵـەوە کـە منیـان تـیٚ خزانـدبوو، نەمـدەتوانی لەگەڵ هیچ کەسێکدا بەمجۆرە قسان بکەم. هەقی ئەوەم نەبوو خۆم میهرەبـان بنوێنم، هەقی ئەوەم نـەبوو خۆم چاکەخواز نیشان بدەم. هەمدیس هەوڵمدا گوێ بگرم. چونکە دادستانەکە دەرهەق بە رۆحی من قسـەی دەکرد.

دەیگووت کە: ئاغایانی قازی لە رۆحی من وردبووەتـەوە، بـەلاٚم هـیچ شـتێکی تیـا نـەبینیوە. دەیگـووت لەڕاستیا من رۆحم نییە وهیچ خەسڵەتێکی مرۆڤانی لە مندا نییە. لـەو پرەنسـیپە ئەخلاقیانـەی کـە دڵـی مرۆڤ دەپارێزن تاقە یەکێکیانم تیا نییە. و لەسەری رۆیی: ((بێگومان ناتوانین گلـەیی نـەبوونی شـتێکی لێ بکەین کە نەیتوانیوە بە دەستی بێنێ. بەلاٚم لێـرەدا، لـەم دادگاییـەدا، فەزیلـەتی سـەلبی لێبـوردەیی و مەدارا بگۆڕێ بۆ فەزیلەتێکی سەخت تر، بەلاٚم بالاٚتر، بۆ فەزیلـەتی داد پـەروەری. بەتاییـەتی کـاتیٚ کـە دڵێکی ڤـالا، بـەو جـۆرەی کـە لـەم پیـاوەدا دەی بیـنین دەبـیٚ بـە هەڵـدێرێك و مەترسـی ئـەوەی لێـدەکریٚ کۆمەڵگەی تیٚ بکەویٚ.)) لەم دەمەدا بوو کە باسی تەرزی رەفتاری منی لەگەڵ دایکمـا هێنایـە ئـاراوە. هـەر هەموو ئەو شـتانەی کـە لـەماوەی محاکەمەکـەدا باسـی کردبـوون، دووبـارەی کردنـەوە، لێ زۆر زیـاتر لـەو کاتەی کە سەبارەت بە تاوانەکەی من قسەی دەکرد، قسەی کرد. هێندەی درێژدادڕی کرد کە ئـە نجام جگـە لە گەرمای ئەو بەیانییە هەستم بە هیچی دی نەدەکرد تا ئەو دەمەی کە دادگەرەکـە لـە قسـە وەسـتاو دوای کەمێك بێدەنگی، دووبارە بەدەنگی بەرزو کاریگـەر دەسـتی بـە قسـان کـردەوە: ((ئاغایـان، ئـەم دادگایـە سبەینیٚ دەربارەی چەپەڵترین ودزێوترین تاوان، واتا تـاوانی بـابکوژی داوەری دەکـات.)) بـە بـاوەڕی ئـەو تەسەور لە هەنبەر ئەم تاوانە ترسناکەدا دەستەوستان دەبیٚ. دەیگووت بەو پەڕی جورئـەت و ڕاشـکاوییەوە هێڤیدارە کە دادخوازی جەماوەری خەڵك بێ هیچ کەم و کوڕی و سستییەك سزای ئەم تاوانە بدات. بەلاٚم لـە گووتنی ئەمەش نەدەپرینگایەوە کە ئەو نەفرەتەی ئەم تاوانی بابکوژییە لە لای دروست کردبـوو، لەچـاو ئەو نەفرەتەی کە لە ئە نجامی خەمساردی و بـیٚ موبـالاتی منـەوە لای دروست بووبـوو، کـەمتر بـوو زیـاتر نـەبوو. هـەروەها بـەباوەڕی ئـەو، پیاوێـك کـە لـەرووی ئەخلاقییـەوە دایکـی خـۆی بکـوژیٚ، وەکـو هـەمان

تاوانکارە کە دەستی تاوانی بۆ ئەو کەسە درێژ کردووە کە ژیانی پێ بەخشیوە، زیان بە کۆمەڵگە دەگەیەنێ. بەهەرحاڵ یەکەمیان زەمینە بۆ دووەمیان خۆش دەکات. یەکەمیان بە شێوەیەك لە شێوەکان سەرمەشقی دووەمەو شەرعیەتی پێ دەبەخشێت، و بەدەم دەنگ بەرزکردنەوە لەسەری رۆیی: ((ئاغایان، من دڵنیام کە ئەگەر بڵێم ئەو پیاوەی کە لەسەر ئەم تەختە دانیشتووە تاوانەکەی لە گەڵ تاوانی ئەو پیاوەدا کە دەبێ سبەینێ لێرەدا دادگایی بکرێ یەکێکە، ئەوا لێم ناگرن و قسەکەم بە زیادەڕۆیی نازانن. لە ئە نجامدا دەبێ بە سزای خۆی بگات.))لێرەدا دادستانەکە سەروچاوی لە ئارەقە هەڵکشاوی خۆی سڕی و ئەوجا گووتی هەرچەندە ئەرکێك بە سویی لە ئەستۆیە، بەلام بێ دوودڵی ئە نجامی دەدات، و رایگەیاند کە من هیچ کارێکم بەکاری کۆمەڵگەوە نەبووە کە بنەرەتیترین یاساو رێ و رەسمەکانیم پێشێل کردووە، و لەدوائە نجاما ناتوانم بە دڵێکەوە کە سەرەتایی ترین کاردانەوەی نییە داوای کۆمەك لە کۆمەڵگەیەکی واهی بکەم، ئەوجا گووتی: ((من سەری ئەم پیاوەم لە ئێوە دەوێ و بەدڵێکی ئاسودەوە ئەم داوایەتان لێدەکەم، چونکە ئەگەرچی لەماوەی ئەم کارە دووروودرێژەمدا چەندین جار داوای ئەم جۆرە سزا قورسانەم کردووە، دەبێ ئەوە بڵێم کە هیچ جارێك بەورەبەرزی ئەمڕۆکەوە، ئەم ئەرکە دژوارەم ئە نجام نەداوە. چونکە گازییەکی بێ چەندو چوون و پیرۆز ئەم ئەرکە دژوارەم دەخاتە ئەستۆ و ئەو نەفرەتەی کە بە دیتنی ئەم پیاوە شەیتان رەفتارە لەلام دروست دەبێ دوا شوێنەواری دوودڵیم لەدڵ دەردەکات.))

کاتێ دادستانەکە لە شوێنەکەی خۆی دانیشت، بێدەنگییەکی هەندێ دوورو درێژ بەرقەرار بوو. من لە گەرماو لە سەرسامیدا گێژو مەنگ بووبووم. سەرۆك تۆزێ کۆکی و بەدەنگێکی یەجگار ئەسپایی لێی پرسیم کە ئاخۆ هیچم نییە بیڵێم؟ هەستام و چونکە حەزم دەکرد قسە بکەم، -ئەللا خوایی گووتم کە بەنیازی کوشتنی ئەو کابرا عەرەبە نەبووم. سەرۆك وەلامی دایەو کە ئەمە تەنیا قسەیەو گوتی تا ئێستا سەری لە جۆری بەرگرییەکەم دەرنەکردووەو زۆری پێ خۆش دەبێ ئەگەر بەر لە قسەکردنی پارێزەرەکەم، ئەو هۆیانە روونبکەمەوە کە وایان لێکرد بووم ئەم کارە بکەم. من لەکاتێکا قسەکانم تێکەڵ و پێکەڵ دەکردو پەیم بە وەزع و حاڵی گاڵتەبازاڕی خۆم دەبرد. بە پەلە گووتم هەتاو باعیسی ئەم کارە بوو. هۆڵەکە پڕبوو لە پێکەنین. پارێزەرەکەم شانەکانی هەڵتەکاندو یەکسەر رێگەی قسەکردنی درایێ. و رایگەیاند کە تازە درەنگەو پێویستی بە چەند سەعاتێکەو تکا دەکات کە دانیشتنەکە بخرێتە دوای نیوەڕۆ، دادگا قاییل بوو.

لە دوای نیوەڕۆ پانکە کارەباییەکان هەوای قورسی هۆڵکەیان دەجولاندو باوەشێنە بچووك و رەنگاو رەنگەکانی قازییەکانیش بەیەك ئاڕاستەدا دەجولان. پێدەچوو کە بەڕەڤانی پارێزەرەکەم هەرگیز تەواو نەبێ. لەگەڵ ئەمەشا لەدەمێکی دیاریکراوا گوێم بۆ رادێرا. چونکە دەیگووت راستە کە من بکوژم. ئەوجا بە هەمان تۆن درێژەی بە قسەکەی خۆی دا . زۆرم پێ سەیر نەبوو هەرجارێ دەهاتە سەرباسی من، وشەی ((من))ی بەکاردەهێنا. بەلای پۆلیسێکا دانەویمەوەو هۆی ئەمەم لێ پرسی، پێی گووتم بێدەنگ بم و پاش تۆزێك گووتی: (( هەموو پارێزەرەکان وادەکەن.)) هەستم کرد کە ئەم کارە هێندەی دی لە دادگاییەکە دوورم دەخاتەوە، زەربی سفرم دەکات. بە گوتەیەکی دی ئەو خۆی لە شوێنی من دادەنات. بەلام پێم وایە هەر لە ئێستاوە زۆر لە دانیشتنی دادگاییەکە دوور خرابوومەوە. ئەوەی راستی بێ پارێزەرەکەشم وەکو مەخسەرەیەك دەهاتە بەرچاو.

زۆ بە پەلەو خێرا بەرگری لە بابەتی ئەو بانگەشانە کرد کە بۆ من کرابوون و ئەوجا ئەویش هاتە سەرباسی رۆحی من. بەلأم وا هاتە بەرچاو کە زۆر لە دادستانەکە بێ توانـاترە. گـووتی: (( منیش لە نزیکەوە سەرنجی رۆحی ئەم پیاوەم داوە، بەلأم بە پێچەوانەی دادستانی بەرێزەوە، کۆمەلێك شتم تیا بەدی کردووە. و دەتوانم بلێم کە پەڕە بە پەڕەی رۆحی ئەوم خوێندووەتەوە. )) لە کتێبی رۆحی منا ئەوەی خوێندبووەوە کە من پیاوێکی شەریف، کارمەندێکی رێك و پێك و ئیشکەرو پشوودرێژ، و وەفاداربووم سەبارەت بەو دایەرەیەی کە کارم تیا دەکرد. خۆشەویستی هەمووان و هاوخەمی ناخۆشی خەڵکانی دی بووم. بە بۆچوونی وی من کوڕێکی نموونەیی بووم کە بۆ ماوەیەکی زۆر، تا لەتوانامدا بوو خزمەتی دایکی خۆم کردبوو، و لە دوا ئەنجاما بە هیوا بووبووم کە کەترەخانە، هۆکاری ئاسودەیی و ئارامی، کە دەرامەتی ناچیزی من ئەوەی پێ هەڵنەدەسوڕا، بۆ ئەم پیرێژنە فەراهەم بکات. و لەسەری رۆیی: (( ئاغایان، من پێم سەیرە کە ئەم هەموو هەراو هوریایە لەسەر ئەم کەترەخانەیە نراوەتەوە. خۆ باشترین بەڵگە لەسەر سوودو گەورەیی ئەم دەزگایانە ئەوەیە کە دەوڵەت بەخۆی کۆمەکی داراییان دەکات. )) بەلأم چ قسەیەکی لەمەڕ رێورەسمی ناشتنەکە نەکرد و هەستم کرد کە گووتە بەرگرییەکەی لەم رووەوە نوقوستانە. بەلأم بە هۆی ئەم هەموو رستە درێژانەو ئەم رۆژانەو ئەم سەعاتە بێ کۆتاییانە کە باسی رۆحی منیان تیا کردبوو، هەستم کرد کە هەموو شتێك لەبەرچاوم بووە بە ئاوێکی بێ رەنگ و من تیایدا دووچاری سەرەگێژکێ بووم.

لەئەنجاما تەنیا ئەوەندەم بە بیر دێ کە کاتێ پارێزەرەکەم درێژەی بەقسەکانی خۆی دەدا، لە کوچەو کۆلأنەکانەوە، لەناو هۆڵەکەو لەناو دادگاکەوە، دەنگی شەیپوری بەستەنی فرۆشێك دەنگی دایەوەو گەییە گوێم. یادو بیرەوەریانی ژیانێك کە چیتر پەیوەندی بە منەوە نەبوو، بەلأم من ناچیزترین و مکومترین شادییەکانی خۆم تیا بینی بووەوە، هێرشیان بۆ هێنام: بۆن وبەرامەی هاوین، گەرەکێك کە خۆشم دەویست، ئاسمانی شەو، خەندەو جلەکانی ماری. ئەو کارە بێهودانەی کە لەم دادگایەدا ئەنجامم دەدا بینی گرتم. خواخوام بوو زووتر تەواوی بکەن، تا دووبارە بۆ ژوورەکەم بچمەوەو بخەوم. بۆیە بەحاڵ گوێم لە پارێزەرەکەم بوو کە لەکۆتایی قسەکانیا هاواری کردو دەیگووت کە داد پرسان، کارمەندێکی شەریف بەهۆی ئەوەوە کە بۆ ساتێك شعوری خۆی لەدەست داوە، حوکمی مەرگ نادەن، و داوای سووککردنی سزای ئەو تاوانەی دەکرد کە من لەئێستاوە باری سەنگینیم هەڵدەگرت ودەیگوت توندترین سزا بۆ من پەشیمانی ئەبەدییە. دانیشتنەکە هەڵگیراو پارێزەرەکەم بە شەکەتی دانیشت. لێ هاوکارانی بۆ دەست خۆشی هاتن بۆلای. رستەی (( جوانبوو ئازیزەکەم )) بەرگوێ کەوت. تەنانەت یەکێك لەوانە بۆ سەلماندنی قسەکەی خۆی رای منی پرسی و گووتی: (( وانییە؟ )) من قسەکەیم سەلماند، بەلأم دەستخۆشییەکەم راستگۆیانە نەبوو. چونکە زۆر ماندوو بووبووم.

لەم کاتانەدا، لەدەرەوەی دادگا، رۆژ بەرەو تەواو بوون دەچوو و دەقی گەرما کەمتر بووبووەوە. بەو دەنگانەیا کە لە کۆلأنەکانەوە دەگەییینە گوێم هەستم بە جوانی خۆر ئاوا کرد. هەمووان هەرچاوەروان بووین، ئەوەی کە چاوەڕوانی بووین، تەنیا پەیوەندی بە منەوە بوو. سەیرێکی ناو هۆڵەکەم کردەوە، هەموو شتەکان وەکو رۆژی یەکەم بوون. نیگام لە نیگای رۆژنامەوانە چاکەت کەوەییەکەو ژنە زیتەڵەکە هەڵەنگووت. ئەمە وای لێکردم بیرم بکەوێتەوە کە بە درێژایی ماوەی دادگاییەکە چاوم بۆ ماری نەگێڕابوو.

لەبیرم نەکردبوو، بەلاَم زۆر مژوڵ بووم. ئەوم لە نێوان سیلست و ریمۆندا بینی. سوکە ئاماژەیەکی بۆ کردم. لەتۆوایە دەیگووت: ((ئاخری.))و سیمای کەمێك نیگەرانیم بینی کە پێدەکەنی. لیَ هەستم دەکرد کە دڵم گیراوەو تەنانەت نەمتوانی وەلاَمی خەندەکەشی بدەمەوە.

قازییەکان هاتنە سەر جێگای خۆیان. بە پەلەیەکی زۆر خێرا زنجیرە پرسیارێك بۆ قازییەکان خوێنرایەوە. گوێم لە وشەیەلی: ((تاوانبار بەکوشتن،)).. ((قەستی پێشوەختە))((فاکتەرێن سوککردن)) بوو. قازییەکان وەدەرکەوتن و منیان بۆ ئەو هۆڵە بچووکە بردەوە کە پێشتر لەویَ چاوەڕوان بووم. پارێزەرەکەشم خۆی گەیاندمیَ. زۆر بە پەلە قسەی دەکرد. بە دڵنیایی و میهرەبانییەکی ئەوتۆ دوواندمی کە پێشتر لێم نەدی بوو. پیَی وابوو کە قەزییەکە بە باشی دەڕوات و من بەچەند سالیَ حەپس لەگەلْ کاری سەختا لەم گرفتارییە دەخەلەسم. لێم پرسی ئەگەر داوەرییەکە خراپ شکایەوە ئومێدی ئیعتراز هەیە؟ وەلاَمی دامەوە نە. چونکە ئەو بۆ ئەوەی ئەندامانی دادگا تووڕەو ناڕەحەت نەکات عادەتی وایە کە پێشوەختە داوای تازەکردنەوە ناکات. وبۆی ڕونکردمەوە کە هەروا بەئاسانی و بیَ چ هەنجەتێك ئەم جۆرە حوکمە تەمیز ناکرێتەوە. بۆچوونەکەیم پیَ پەسندبوو و خۆم تەسلیمی بەلگەکانی ئەو کرد. ئەگەر ئاسایی بڕوانینە بابەتەکە، دەبینین مەسەلەیەکی تەواو ئاساییە. بە پێچەوانەوە دووچاری کاغەزبازییەکی خۆڕایی دەبین و پارێزەرەکەم گووتی: ((بەهەرحالْ هەرچۆنیَ بیَ دەتوانی بە شێوەیەکی ئاسایی داوای تەمیز بکەی. بەلاَم من دڵنیام کە ئەنجامی داوەرییەکە بە قازانجی ئێمە دەبیَ.))

ماوەیەکی زۆر چاوەڕوا نمان کرد. نزیکەی وابزانم سیَ چارەکە سەعات. دوای ئەم ماوەیە، زەنگێك لێدرا. پارێزەرەکەم بەدەم بەجێهێشتنی منەوە گووتی: ((سەرۆکی دادگا نهۆ وەلاَمەکان دەخوێنێتەوە. تەنیا بۆ ڕاگەیاندنی حوکمەکە تۆ بانگ دەکەنە ژوورەوە.)) تەقەی چەند دەرگایەك هات. خەلکانێك بە قالدرمەدا غاریان دەدا کە نەمدەزانی نزیکن یا دوور. ئەوجا دەنگێکی منگم بەر گویَ کەوت کە لە هۆڵەکەدا شتێکی دەخوێندەوە. کاتیَ کە دیسان زەنگ لێدرایەوەو دەرگا ژوورە بچووکەکە کرایەوە، شەپۆلی بێدەنگی هۆڵەکەم بۆ هات. هەر بێدەنگی بوو وکاتیَ کە بینیم ئەو ڕۆژنامەوانە لاوە چاوی لیَ گواستووەتەوە، هەستێکی غەریب دایگرتم. سەیری لای ماری یەوەم نەکرد. دەرفەتی ئەم کارەم نەبوو. چونکە سەرۆك بەشێوەیەك غەریب پیَی گووتم کە بەناوی میللەتی فەرەنساوە لە مەیدانێکی گشتیدا، لە ملم دەدریَ. هەنگیَ وام بە خەیاڵدا هات کە مانای ئەو هەستەی کە بە هەموو سیماکانەوە دەمخوێندەوە، تێدەگەم. وا تێدەگەم کە جۆرە هەستێکی ڕێزو حورمەت بوو. پۆلیسەکان زۆر میهرەبان بوون لە گەلما. پارێزەرەکەم دەستی خستە سەر مەچەکم. ئیدی بیرم لە هیچ شتێك نەدەکردەوە. بەلاَم سەرۆك لیَی پرسیم ئایا هیچ شتێکم نییە بیلێم. کەمێك بیرم کردەوەو گووتم: ((نە.))و ئیدی بردیانم.

((٥))

بۆ جاری سێیەم دیتنی کەشیشم ڕەتکردەوە. هیچم نەبوو پیَی بلێم. تاقەتی قسەکردنم نەبوو. ئەمە جگەلەوەی کە بەو زووانە دەی بینم. ئەوەی لەم کاتەدا بۆ من گرنگە، هەلاَتنە لەم میکانیزمە، زانینی ئەمەیە کە ئایا مەفەڕێك بۆ هەلاَتن لەم چارەنووسە حەتمییە هەیە؟ ژوورەکەیان گۆڕیم. لەم ژوورەدا، کاتیَ کە ڕادەکشێم، ئاسمان دەبینم. جگە لە ئاسمان چیدی نابینم. هەموو ڕۆژەکانم بە تەمەشاکردنی

ئاوابوونی رەنگەکانی رووی ئاسمان کە شەو دەدەنە دەم رۆژەوە، بەسەردەبەم. بەڕاکشانەوە دەستەکانم دەنەمە ژێر سەرم و چاوەڕوان دەکەم. نازانم چەندجارم لە خۆ پرسیوە ئایا لە ناو مەحکومان بەمەرگدا کەسێك هەبووە توانی بێتی لەم میکانیزمە هەڵێ. بەر لە ئیعدام کردنەکە وون بووبێ و بازنەی ریزی پۆلیسانی پچڕی بێ؟ ئەوسا لەسەر ئەوەی کە لەمەوپێش بەئەندازەی پێویست لە مەسەلەی ئیعدام و تەول و تەفسیلی ئیعدام ورد نەبووبوومەوە ،خۆم سەرزەنشت دەکرد. مرۆڤ پێویستە هەمیشە بایەخ بەم مەسەلانە بدات. کێ دەزانێ چ روو دەدا. منیش وەکو هەموو خەڵکی ڕا پۆری رۆژنامەکانم خوێندبووەوە. بێگومان لەم بارەیەوە کتێبانی تایبەتی هەبووە کە من وەکو پێویست خولیای خوێندنەوەیان نەبووبووم. لەوەیە ئەگەر ئەمەم کردبا، هەندێ حیکایەتانم لەمەڕ هەڵاتن پەیدا کردبا. هەنگێ دەمزانی کە بەلای کەمەوە بۆ تاقەجارێك رەورەوەکەوەستا بووەو لەم پەلەکارییە حەتمییەدا، رێکەوت و شانس بۆ تاقەجارێك، هەندێ شتیان گۆڕی بووە. یەك جار! لە روویەکەوە پێم وایە ئەم تاقە جارەش بۆ من بەس بوو. دڵم باقییەکەی تەواو دەکرد. رۆژنامەکان بەزۆری قەرزێکیان دەکرد کە کۆمەڵگە لێمانی دەوێ. بەگووتەی ئەوان تاوانبار یا خەتاکار دەبێ ئەم قەرزە بداتەوە. بەڵام ئەمە لەگەڵ خەیاڵ و وێنادا ناگونجێ. نە، ئەوەی بەلای منەوە گرنگ بوو، ئەگەرو دەرفەتی هەڵاتن بوو، بازدانێك بوو بۆ دەرەوەی ئەم هاماجە توندو زاڵمانەیە، ڕاکردنێکی شێتانە بوو کە هەموو ئەگەرێکی هیواداریی تێدا بوو. هەڵبەتە ئەم هیوادارییە بۆی هەبوو ئەمە بێ کە هەڵاتووەکە لە سوچێکی جادەیەکداو رێك لەگەرمەی راکردنا بە زەبری گوللەیەك بێتە کوشتن. بەڵام دوای تاوتوێ کردنی هەموو لایەنەکانی کارەکە، هیچ شتێك دەرفەتی ئەم فەنبازییەی نەدەدام، هەموو شتێك ئەم فەنبازییەی لێ قەدەغە دەکردم.و دووبارە ئەم دەزگا میکانیکییە بەگیری دێنامەوە.

هەرچیم دەکرد نەمدەتوانی ئەم یەقینە بێ شەرمانەیە دەربارەی خۆم قبوڵ بکەم. چونکە لە نێوان ئەو حوکمەدا کە لەسەر بناغەی ئەم یەقینە دارێژرابوو وچوونە پێشەوەی یەقینەکە لەو ساتەوە کە حوکمەکە ڕاگەیەنرابوو، ناکۆکییەکی کۆمیدیانە هەبوو. لەبەر ئەم حەقیقەتەی کە حوکمی دادگا لەبری لەسەعات هەڤدەدا بخوێنرێتەوە، لەسەعات بیستدا خوێندرابووەوە، ئەم حەقیقەتەی کە دەشیا رەئی دادگا شتێکی تەواو جیاوازبێ ،ئەم حەقیقەتەی کە حوکمەکە لەلایەن کەسانێکەوە کە جلی ژێرەوەیان دەگۆڕن، دەرکرابوو، وبەناوی بیرۆکەیەکی تەمومژاوی وەکو میللەتی فەرەنسا( یا ئاڵمان یا چین )ەوە دانرابوو، وام هات بەبیرا کە هەموو ئەمانە بەشی هەرە سەرەکی جدی بوونی ئەم حوکمەی دەسڕییەوە. لەگەڵ ئەمەشا، لەوساوە کە ئەم قەرارە دەرچووبوو، ناچاربووم بیسەلمێنم کە جێبەجێکردنەکەی وەکو ئەم چوار دیوارەی کە خۆم تیا لە قاڵب دەدەم مکوم وجدییە.

لەم دەمانەدا ئەو حیکایەتەم وەبیر هاتەوە کە دایکم سەبارەت بە بابم بۆی دەگێڕامەوە. من بابی خۆم نەدی بوو. تەنیا شتێ کە دەربارەی ئەم پیاوە لە یادم مابوو، هەر ئەمە بوو کە دایکم لەمەڕ وی بۆی دەگێرامەوە: رۆژێ چووبوو بۆ تەمەشاکردنی ئیعدامکردنی پیاوێ. هەرچەند چوونەکەی پێ ناخۆش دەبێ، بەڵام هەرچووبوو بۆ تەمەشاکردنەکەو، دوای گەڕانەوە تا ماوەیەك بەیانیان دەرشایەوە. ئەوسا هەندێ بەم کارەی بابم قەڵس بووم. بەڵام ئێستا بۆم دەرکەوتبوو کە زۆر ئاسایی بووە. چۆن تا نهۆ نەمزانی بوو کە هیچ شتێك لە حوکمی ئیعدامێك گرنگتر نییە. بەکورتی ئەمە تەنیا شتێك بوو کە بەڕاستی شایستەی بایەخ پێدان بێ. ئەوجا بیرم کردەوە ئەگەر بەرێکەوت لەم زندانە رزگار بووم، دەچمە تەمەشای

جێبەجێکردنی هەموو حوکمێکی ئیعدامان. پێم وایە هەڵەبووم لە بیرکردنەوە لەم ئەگەرە. چونکە بیرکردنەوە لەمەی کە بەیانییەکی زوو خۆم لەدەرەوەی بازنەی پاسەوانان‌دا بەئازادی دەبینمەوەو بەهەرحاڵ لەو دیو ئەوانەوە دەبم، بیرکردنەوە لەوەی کە رووداوێکی واهی بە چاوی خۆ دەبینم و رەنگە دوای تەمەشاکردن دووچاری هێڵنج و رشانەوەبم، ئەم تەسەورو خەیاڵانە دەبوونە مایەی ئەوەی شە پۆلە شادمانییەکی ژەهراوی دڵم بگرێ. بەلام ئەم خەیاڵاتە ئەقڵانی و لۆجیکی نەبوو. چونکە دوای کەمێك سەرمایەکی تووش دەکەوتە گیانم کە لەژێر لێفەکەمەوە بەتوندی هەڵەلەرزیم و بێ ئەوەی جڵەوی خۆم پێ بگیرێ دانەجیرەم پێدەکەوت.

بەلام، هەڵبەتە بنیادەم ناتوانێ هەمیشە هەر ماقوڵ بێ. بۆ وێنە جاران هەندێ کات پرۆژە یاسام دادەرشت. بەجۆری سزاکاندا دەچوومەوەو دەستکاریم دەکردن، ئەوەم بۆ دەرکەوتبوو کە مەسەلەی بنەرەتی ئەمەیە کە سوکە ئومێدێك بە مەحکوم بدرێ. یەك لە هەزاری شانسێکی واهی بەس بوو بۆ ئەوەی گەلێك لەمەسەلەکان بگۆرێ. بۆ نموونە وام بە خەیالا دەهات کە دەشێت دەرمانێکی کیمیایی تایبەتی بەدەست بهێنرێ کە بەکارهێنانی لە هەر دە نەفەرا نۆ نەفەر لەنەخۆشان(( لە خەیاڵی خۆدا نەخۆشم لە جیاتی مەحکوم بەکار دێنا.)) بکوژێت. بەمەرجێ خودی نەخۆشەکە بەمە بزانێ. چونکە پاش وردبوونەوەو لێکۆڵینەوەی وردی شتەکان، بۆم دەرکەوت کە خەوشی بنەرەتی ئیعدام بە ساتۆری گیوتین لەمەدایە کە هیچ جۆرە شانسێکی تێدا نییە. بە هیچ جۆرێ. بەم جۆرە ئیعدامە مەرگی نەخۆش حەتمییە. ئەم جۆرە ئیعدامە کارێکە براوەتەوە وسیستەمێك بوو گۆران نا پەزێر وسۆزێ بوو دەربارەی کارێك کە ئەگەری هیچ جۆرە گەرانەوەیەکی تیا نییە، خۆ ئەگەر بە هۆی موجیزاتێکەوە ساتۆرەکە دانەیەتەوە، کارەکە دووبارە دەکەنەوە جا لەئەنجامی ئەمەوە، دەبوایە مەحکوم خۆزیا بخوازێ ئامێرەکە باش کار بکات، کە ئەمە لە هەموو شت پتر مایەی نارەحەتی بوو. من دەڵێم: ئەمە لایەنی عەیبداری کارەکەیە. ئەمە لەلایەکەوە تارادەیەك دروستە. بەلام لەلایەکی دیکەوە ناچار بووم بیسەلمێنم کە هەموو نهێنی و رازی رێکخراوێکی باش لەمەدا پەنهانە. بەڵێ، لەم حاڵەدا مەحکوم ناچاری هاوکاری مەعنەوییە. قازانجی لەمەدایە کە کارەکان بێ هیچ کۆسپێك جێ بەجێ بین.

هەروەها ناچاربووم بیسەلمێنم کە تا ئێستا ئەو بۆچوونانەی لەمەر ئەم پرسانە هەمبوون دروست نەبوون. ماوەیەك وام خەیاڵ دەکرد- ونازانم بۆچی- کە بۆ چوونە پای گیوتین( مەقسەڵە ) دەبوایە بچییە سەر سەکۆیەك و بە پەیژەدا سەربکەوی. وادەزانم ئەم خەیاڵە زادەی شۆرشی ١٧٨٩بوو. دەمەوێ بڵێم بەهۆی هەموو ئەو شتانەوە بوو کە دەربارەی ئەم بابەتانە فێریان کردم یا نیشانیان دابووم. بەلام بەیانییەك، وێنەیەکم بیرکەوتەوە کە رۆژنامەکان بەبۆنەی ئیعدامکردنێکی پر دەنگ و دەنگدانەوە بلاویان کردبووەوە. لەو وێنەیەدا، ئامێری ئیعدامەکە( مەقسەڵەکە ) زۆر بەبێ بایەخی لەسەر عاردەکە دانرابوو. لەوە تەنگتر بوو کە تەسەورم دەکرد. سەیر بوو کە پێشتر بیرم لەم وێنەیە نەکردبووەوە. ئەم ئامێرە لە وێنەکەدا بووە مایەی راکێشانی سەرنجی من چونکە وەکو دەزگەیەکی وردو پەرداختەو بریقەدار دەینواند. بنیادەم هەمیشە دەربارەی ئەو شتەی نایناسێت موبالەغە دەکات. من دەبوایە بە پێچەوانەوە پەی بە سادەیی شتەکان ببەم. چونکە ئامێرەکە لە ئاستی ئەو زەلامەدایە کە بەرەولای دەچێت. مەحکومەکە بەجۆرێ بەرەولای دەچێت وەك ئەوەی بچێتە دیداری کەسێك. ئەمە لەلایەکەوە مایەی

ناڕەحەتی بوو. چونکە سەرکەوتن بەسەر سەکۆکەداو بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان بۆ خەیاڵ و تەسەور خۆشتر بوو. بەلاّم لێرەدا ئامێرەکە هەموو شتێك وردو خاش دەکات، دەیبڕێنێتەوە، و مەحکومەکە بەبێ دەنگی، بە کەمێك شەرمەوەو بە وردییەکی زۆرەوە دەکوژێت.

دوو شتی دیکەش هەبوون کە هەمیشە بیرم لێدەکردنەوە: سپێدەو تەمییزخوازی. لەگەڵ ئەمەشا سێ ودووی خۆم دەکردو هەوڵم دەدا کە ئیدی بیر لەم شتانە نەکەمەوە. رادەکشام، دەمڕوانییە ئاسمان و هەوڵم دەدا دڵی بدەمێ. ئاسمان کەسك دەبوو، شەو دەهات. هەمدیس هەوڵم دەدا ڕەوتی بیرکردنەوەم بگۆڕم. گوێم لەترپەی دڵم دەگرت. هەرگیز نەمدەتوانی خەیاڵی ئەوە بکەم کە ئەم دەنگەی ئەم هەموو ماوە درێژە لەگەڵما بووە بتوانێ بوەستێ. من هەرگیز خەیاڵ و خەیاڵکردنێکی ڕاست و دروستم نەبووە، لەگەڵ ئەمەشا هەوڵم دەدا ئەو چەند ساتەی کە ئیدی لێدان و ترپەی ئەم دڵە لە مێشکما دەنگ ناداتەوە لە خەیاڵی خۆدا بەرجەسە بکەم. بەلاّم بێهودە. سپێدەو تەمییزخوازی بەرێوەبوون، لەبەردەمما بوون. سەرەنجام دەگەییمە ئەم ئەنجامەی کە بەخۆ بڵێم ئاقلاّنیترین کار ئەوەیە کە زۆر لەخۆ نەکەم.

ئەمەم دەزانی کە سپێدە دێن بە دووما. بەشێوەیەکی گشتی شەوانم بەچاوەڕوانی ئەم سپێدەیەوە دەقەتاند. هەرگیز حەزم لێ نەبوو غافڵگیر ببم. کە شتێکم بۆ دێتە پێشێ حەزدەکەم کە تەیارو ئامادەبم. هەرلەبەر ئەمەش بەرۆژەوە کەمێك دەخەوتم و بەدرێژایی شەوان چاوەڕوان بووم کە ڕوناکی لە کلاّورۆژنەکەی ئاسمانەوە هەڵبێ. دژوارترین کاتم، ئەو کاتە نادیارەبوو کە دەمزانی حوکمەکەی تیا جێبەجێ دەکەن. کە نیوەشەو دەبوری چاوەڕوانم دەکرد و پێشتر هەرگیز گوێچکەم ئەم هەموو دەنگەی نەگرتبوو، و یا ئەم هەموو دەنگە وردانەی دیاری نەکردبوو. ئەلهەقی دەتوانم بڵێم کە بەشێوەیەك لە شێوەکان بەدرێژایی ئەم ماوەیە بەخت یارم بوو. چونکە هیچ کاتێك گوێم لەدەنگی پێیەك نەبوو. دایکم زۆرجار دەیگووت کە هیچ کاتێ مرۆڤ بەتەواوەتی بەدبەخت نییە. لەزندانەکەما، گاڤێ کە ئاسمان سوور دەبوو، و رۆژی تازە بەئەسپایی بۆ ژوورەکەم دەخزی، قسەکەی ئەوم دەسەلماند. چونکە زۆر چاك دەشیا گوێم لەدەنگی پێیەك بێ وزۆر چاك دەشیا دڵم بتەقێ. ئەگەرچی کەمترین و بچووکترین دەنگ بەرەو دەرگاکەی دەبزواندم، ئەگەرچی گوێم بە تەختەی دەرگاکەوە دەناو بە شپرزەییەوە هێندەم چاوەڕوان دەکرد تا دەنگی خۆم دەژنەفت و کە گوێم لێدەبوو وەکو خنکەخنکی تۆپینی سەگ دەچێت، ترسم لێدەنیشت، لە کۆتایی ئەم کارەشدا دڵم نەدەتەقی..و هەنگێ بیست و چوار سەعاتی دیکەم قازانج دەکرد یا دەبردەوە.

بەدرێژایی رۆژ بیرم لە تەمییز دەکردەوە. پێم وایە بە باشترین شێوە سوودم لەم بیرە وەرگرتبوو. کە حیسابی خۆم دەگرتەوە، باشترین دەسکەوتم لە بیرەکانی خۆم بەدەست دێنا هەمیشە خراپترین گریمانەم دەکرد. و وام گریمانە دەکرد کە داوای تەمییزو بەخشینەکەم ڕەت کراوەتەوە. ((ئێ، کەواتە دەمرم.)) ئەمە زۆر زووتر لە شتەکانی دی ئاشکرابوو. هەموو خەڵکی دەزانن کە ژی شایستەی ژیان نییە. بەڕاستی من لەوە بێ ئاگا نەبووم کە مردن لە سی ساڵیدا یان لە هەفتا ساڵیدا گرنگییەکی ئەوتۆی نییە، چوونیەکە، چونکە، هەڵبەتە لەهەردوو حاڵەتەکەدا پیاوان و ژنانی دیکە دەژین. و ئەمە هەزاران ساڵ بەردەوام دەبێ. بەکورتی، چ شتێك لەمە روونتر نەبوو. هەمیشە من بووم کە دەمردم، چ ئێستا بێ و چ بیست ساڵی دیکە. بەلاّم ئەوەی لەم کاتەدا کەمێك ناڕەحەتی دەکردم، ئەوەبوو کە بیرم لەبیست ساڵی ئایندە دەکردەوە هەستم بە داچڵەکینێکی ترسناك دەکرد. بەلاّم بۆ دامرکاندنەوەی ئەم داچڵکینە دەروونییە ئەوەندە بەس

بوو كە بيركردنەوەو هزرينى بيست سالّى ئايندەم لەبەرچاودا بەرجەستە بكەم وبزانم كـە لـەو زەمانەشـدا هيچ چارەيەكم نييە جگە لە قابيل بوون بە مەرگ. كاتێ كە مەرگى بنيادەم بوو بەشتێكى بەلگـە نەويست ئيدى چۆنييەتى و گاڤى مردنەكە بايـەخێكى نييـە. كەواتـە(( دژوار ئەمـە بـوو كـە ئـەم (كەواتەيـە) لـە بەلگەو هە نجەتە هزرييەكان دوور نەدەخرايەوە)) كەواتە دەبووايە بەرەت كردنەوەى تەمييزەكـەم قـابيـل بم..

لەم ساتەدا، دەتوانم بلێم تەنيا لەم ساتەدا بوو كە هەقى ئەوەم هەبوو بەجۆرێك رێگـە بـەخۆم بـدەم كە لە دووەمين گريمانە نزيك ببمەوە. واتە عـەفوو بكـرێم. ئـەوەى مايـەى نارەحـەتى بـوو ئەمـە بـوو كـە دەبووايە ئەم هەلچوونى خوێن و بەدەنەى كە شادمانييەكى شێتانەى دەرشـتە چـاوەكانمەوە لـە هەلچـوون بخەم. دەبوايە خۆم وا لێبكەم كە ئەم فريـادە دەروونييـە كـەم بكەمـەوەو بيخەمـە قـالبێكى ئەقلانييـەوە. دەبوايە تەنانەت لەم گريمانەيەشدا ئاسايى بم. تا بتوانم كارێكى وابكەم كە گريمانەى يەكـەم بـەجێتر بنوێنم. و نزيكتر بێ لە ماقولەوە. ئەگەر لەم كـارەدا سـەركەوتبام، ئـەوا يـەك سـەعات ئـاراميم بەدەست دەهێناوئەمەش خۆى لە خۆيدا كەم نەبوو.

لە ساتێكى ئارامى وەهادابوو كە جارێكى ديكە پێشوازى قەشەم رەفز كرد. راكشـابووم و بـەرەنگى زەردى ئاسمانـا وام مەزەنـدە دەكـرد كـە خـۆرى هـاوين لـە ئـاوابوون نزيـك دەبێتـەوە. تـازە لـە رەتكردنـەوەى تەمييزەكەم بووبوومەوە، دەمتوانى هەست بـەوە بكـەم كـە شـەپۆلى خـوێن بـە رێـك و پێكـى لـە بـەدەنما دەسورێتەوە. پێويستم بە ديتنى كەشيش نەبوو. دواى ماوەيەكى زۆر بۆ يەكەمجار، بيرم لـە مـارى كـردەوە. دەمێك بوو كـە نامـەى نەدەنووسـى. بـەم دەمـى زەردە پـەرى ئێوارەيـە بـيرم كـردەوەو بـەخۆم گـووت لەوەيـە تاقەتى لەوەچووبێ كە ماشقەى بنيادەمێكى مەحكوم بە ئيعدامە. هـەروەها ئەوەشـم بـە خـەيالا هـات كـە رەنگە نەخۆش بێ يا مردبێ. هەر يەكێك لەم دووانە بەشێك بـوون لـە مەسـەلە ئاسـاييەكانى ژيـان. چـۆن دەمتوانى ئەوە بزانم، لە كاتێك جگە لە بەدەنمان كە نهۆ لێكـدى دابرابـوون، هـيچ شـتێكى ديكـە ئێمـەى پێكەوە نەدەبەستەوەو بيرى يەكترى نەدەخستينەوە. ئەلهەقى لەم ساتە بەدواوە يادى مارى-م لەلا بوو بە شتێكى ئاسايى. ئەگەر مردبێ، گرنگ نييـە. مـن ئـەم شـتەم پـێ ئاسـايى بـوو. چـونكە بـاش دەمزانـى كـە خەلكيش من لەدواى مەرگم لەبيرم دەكەن. كاريـان بـەكارى منـەوە نـابێ. تەنانـەت نەمـدەتوانى بلێم كـە بيركردنەوە لەم شتە سەخت بوو. لە راستيا هيچ بيرێك نييە كە مرۆڤ لە ئە نجاما لە گەليا رانەيەت.

رێك لەم كاتەدا كەشيشەكە وەژووركەوت. كە ئەوم بينى تەزوويەكى لەرزم پێدا هـات. ئـەويش هەسـتى پێكردو گووتى هيچ ترسێكم نەبێ. پێم گووت كە عادەتەن دەبوا كاتێكى ديكە بێت. وەلامى دامەوە كە ئـەم ديدارە ديدارێكى تەواو دۆستانەيەو پەيوەندى بەو داواى تەمييزەوە نييە كە ئـەو هيچـى دەربـارە نـازانێ. لەسەر جێگەكەم دانيشت و داواى لێكردم لە نزيكييەوە دانيشم. قەبولم نەكرد. لەگەلْ ئەوەشـا زۆر نـەرم و ميهرەبـان هاتە بەرچاوم.

بـۆ ماوەيـەك دانيشـت. باسـكەكانى لەسـەر زرانييـەكانى بـوون و سـەرى دانەوانـدبوو و دەيروانييـە دەستەكانى، دەستەكانى ناسك و خرپن بوون، كە جووتێ گيانلەبەرى بزێويان بيردەخستمەوە. بەنەرمى بە يەكيدا مالين. ئەوجا هەر بەم دەقەوە، بەسەرى داخراوەوە، ئەوەندە مايەوە كە بۆ سـاتێ هەسـتم كـرد كـە فەرامۆشم كردووە.

لـە پڕ سـەری هـەڵبڕی و نیگـای بڕییـە دەموچـاوم و گـووتی: (( بۆچـی هەمیشـە خـۆت لـە دیـدەنی مـن دەدزییەوە.)) وەڵامم دایەوە کە باوەڕم بەخوا نییە. ویستی بزانیّ کە لـەم شـتە دڵنیـام. گـووتم تـا ئێسـتا ئەمەم لەگەڵ خۆدا تاوتویّ نەکردووە چونکە ئەم بابەتە بەلای منەوە مەسەلەیەکی بـیّ بایەخـە. هـەنگیّ خۆی بەدوواوە بردو پشتی بە دیوارەکەوە دا. دەستەکای بە کراوەیی خستنە سەر ڕانەکانی. تەقریبەن وەکو ئەوەی قسە لەگەڵ منا نەکات گووتی هەندیّ جـار بنیـادەم وادەزانـیّ کـە دڵنیایـە. بـەلام لەڕاسـتیا دڵنیـا نییە. من هیچم نەگووت. نیگای کردم و پرسـی: ((ڕات لەمبارەیـەوە چییە؟)) گـووتم ڕەنگـە ئەمـە وابـیّ. بەهەرحاڵ ڕەنگە دڵنیا نـەبم لـەوەی کـە مەبەسـتمە. بـەلام تـەواو دڵنیـام لـەوەی کـە مەبەسـتم نییـە. و بەڕاستی ئەوەی ئەو دەیگووت بۆ من مەبەست و گرنگ نەبوو.

چاوەکانی وەرگێڕان و بە هەمان دەقەوەو بیّ ئەوەی وەزعی خۆی بگۆڕیّ لیّی پرسیم ئایائەم قسەیەم لە ڕووی نائومێدییەوە نییە؟ بۆم ڕونکردەوە کە من نائومێد نیم. تەنیا دەترسم، و ئەمەش ئاسـاییە. گـووتی: (( کەواتە خوا کۆمەکت دەکات. هەر هەموو ئەو کەسانەی کە من لەم وەزع و حاڵەی تۆدا دیتومن بـۆلای خـوا گەڕاونەتەوە.)) گووتم ئـەو کەسـانە هـەقی خۆیـان بـووە. و ئەمـەش دەسـەلمێنیّ کـە ئەوانـە وەختـی ئـەم کارانەیان هەبووە. من نامەویّ کەس یارمەتیم بدات، بەڕاستی کاتی ئەوەم نییە تا بایەخ بەشتیّ بدەم کە مەبەستم نییە.

لەم ساتەدا بە نارەحەتییەوە دەستەکانی جولاّند. پاشان بەسەر خۆیدا زاڵ بوو و چرچی جبەکـەی ڕێـك خست. کاتیّ کە ئەم کارەی تەواو بوو، لەکاتێکا کـە بـە((هـاوڕێم)) دەیـدوانم، گـووتی ئەگـەر ئـەو بـەم شێوەیە لەگەڵ منا دەدویّ لەبەر ئەمە نییە کە مەحکوم بە مەرگم. بەباوەڕی ئەو ئێمە هـەموو هـەر مـەحکوم بە مەرگین. لیّ من قسەکەیم بڕی و ئەم دوو مەحکومیەتە چوون یەك نین. ئەمـە جگـە لـەوەی کـە ئـەم شـتە هەرگیز نابێتە مایەی سوکنایی بیرو ئاسـودەیی. قسـەکەی سـەلماندم و گـووتی: ((هەڵبەتـە وایـە، بـەلام ئەگەر ئەمڕۆ نەمری، سبەی هەردەمری. هەنگیّ ڕووبەڕووی هەمان مەسەلە دەبیتەوە. چـۆن تەحـەمولی ئـەم ئەزموونە ئەستەمە دەکەی؟))وەڵامم دایەوە ڕێك وەکو چۆن ئێستا تەحەمولی دەکەم، تەحەمولی دەکەم.

هەنگیّ لەجێی خۆی هەستاو ڕێك چاوی لە دوڕچاوم بـڕی. ئەمـە گەمەیەکـە تـایبەتییـەو مـن زۆر چـاکم دەزانی. زۆرجار ئەم گەمەیەم لەگەڵ عەمانۆئیل یان سیلست دا دەکردو، بەشێوەیەکی گشتی ئـەوان چـاویان دادەخست. کەشیشەکەش ئەم گەمەیەی باش دەزانی. یەکسـەر ئەمـەم بـۆ دەرکـەوت: نیگـای نەدەلـەرزی، و هەروەها دەنگیشی نەدەلەرزی کاتیّ پیّی گووتم: ((کەواتە هیچ ئومێدێکت نییە، بـەم بـیرەوە دەژی کـە بـۆ هەمیشە دەمری؟)) وەڵامم دایەوە: ((بەڵیّ)).

هەنگیّ سەری داخست و دووبارە دانیشتەوە. گووتی دڵی بەحاڵی من دەسووتیّ و پیّی وایە کە تەحـەمولی ئەم جۆرە هزرینە بۆ پیاوێك مەحاڵە. من هەستم کـرد کـە خەریکـە بێتاقـەتم دەکـات. منـیش وەرسـوڕام و چوومە ژێر کلاّورۆژنەکەو شانم بە دیوارەکەو دا. بیّ ئەوەی بەتەواوەتی گویّ لە قسـەکانی بگـرم، گـوێم لیّ بوو دووبارە دەستی بە پرسیاران لە من کـردەوە. بـەدەنگێکی شـپرزەو خێـرا قسـەی دەکـرد. بۆیـە زانـیم کـە هەڵچووە، و باشتر گوێم بۆ شل کرد.

پیّی دەگووتم لیّی عەیانە کە داوای تەمیزەکەم قەبوڵ دەکریّ. بەلام من دەبوایە خۆم لـە بـاری قورسـی ئەو گوناحە ڕزگار بکەم کە بەسەر شانمەوە بوو. بەباوەڕی ئەو عەدالەتی بەشەری هـیچ بایـەخێکی نییـەو

**هەر عەدالەتی خوایی شتە. بیرم خستەوە کە عەدالەتی یەکەم منی مەحکوم کردووە. وەڵامی دایەوە لەگەڵ ئەمەشا ئەم مەحکومییەتە گوناهی منی نەسڕیوەتەوە. گووتم من نازانم گوناه چییە. ئەوان تەنیا ئەوەیان تێگەیاندبووم کە تاوانبارم. من تاوانبار بووم. و نەۆ سزاکەیم دەدا، نەدەکرا لەوەی پترم لێ داوا بکەن. لەم ساتەدا، ئەو دیسان هەستایەوە سەرپێ و بیرم کردەوە کە نەدەکرا لەم ژوورەتەنگەدا بە جۆرێکی دیکە بجوڵێ. یا دەبێ دانیشێ یان بە پێوە بوەستێ. چاوم بڕی بووە عاردەکە. هەنگاوێکی بەرەو من ناو وێستا. لەوە دەچوو زات نەکات بێتە پێشترەوە. لە بەینی شیشەکانەوە دەیڕوانییە عاسمان. پێی گووتم: (( کوڕەکەم تۆ هەڵەیت. دەشێت لەمە پترت داوا لێبکرێ. ڕەنگیشە داوات لێ بکەن. )) پرسیم: (( لەوەی پتر چ شتێك هەیە؟ )) گووتی: (( دەتوانن داوات لێ بکەن کە ببینی، -چ شتێ ببینم؟ ))**

**هەنگێ کەشیشەکە چاوێکی بە ژوورەکەما گێڕاو بەدەنگێك کە لە پڕ لەلام خەمناك بوو، وەڵامی دایەوە: (( لەم دیوارە بەردینەوە ڕەنج و ئازار دەتکێ، من ئەمە دەزانم. هەرگیز بەبێ عەزاب سەیرم نەکردوون. بەلام لەناخی دڵەوە دەزانم کە کلۆڵترینتان بەچاوی خۆتان دیتوتانە کە سیمایەکی خوایی لە قوڵایی تاریکییانەوە هاتۆتە دەرێ. ئەمە ئەو سیمایەیە کە دەیانەوێ ببینی. ))**

**تۆزێ هەڵچووبووم. گوتم چەندین مانگە کە دەڕوا نمە ئەم دیوارانە. لە دنیادا هیچ شتێك یا هیچ کەسێك نییە کە لەم بەردانەی باشتر بناسم. ماوەیەکی زۆر پێش ئێستا تیایانا بۆ سیمایەك گەڕابووم. بەلام ئەم سیمایە ڕەنگی ئاسمان و گڕی خۆزیای تیا بوو: سیمای ماری بوو و من بێهودە بۆی گەڕابووم. ئیستا ئەویش تەواو بووبوو، و بەهەرحاڵ چ شتێکی دیکەم نەبینی کە لەم بەردە کەوەبیانەوە بێتە دەرێ.**

**کەشیشەکە بە خەمینییەکی تایبەتییەوە سەیری کردم. نەۆ بە تەواوەتی پشتم بە دیوارەکەوە دابوو. وروۆژ دابووی لە ناوچەوانم. کەشیشەکە چەند قسەیەکی کرد کە گوێم لێیان نەبوو، و خێرا لێی پرسیم ئایا مۆڵەتی دەدەم ماچم بکات؟ وەڵامم دایەوە: (( نە )). گەڕایەوەو بەرەو دیوارەکە چوو و بە ئەسپایی دەستی بە دیوارەکەدا هێناو لە ژێر لێوانەوەگووتی: (( باشە تا ئەم رادەیە ئەم زەمینەت خۆش گەرەکە؟ )) هیچ وەڵامێکم نەدایەوە.**

**ماوەیەکی زۆر بەماتی و سەرسامی مایەوە. دەمویست پێی بڵێم بڕوات و وازم لێ بێنێ کە لە پڕێکا بۆلای من گەڕایەوەو بە خرۆشێکی تایبەتییەوە هاواری کرد: (( نە، من ناتوانم باوەڕ بە قسەکانی تۆ بکەم. دڵنیام کە هەر ئارەزووی ژیانێکی دیکەت کردووە. ))وەڵامم دایەوە هەڵبەتە، بەلام ئەم ئارەزووەش وەکو ئارەزووی دەوڵەمەندبوون، یا باش مەلەکردن، یان هەبوونی زارێکی جوانتر، بایەخێکی ئەوتۆی نییە. هەموو ئەم ئارەزووانە لەیەك ریزدان. لێ ئەو دەیویست بزانێ کە من ئەو ژیانەی دیکە چۆن دەبینم. هەنگێ هاوارم بەسەریا کرد: (( ژیانێك کە بتوانم ئەم ژیانەی تیا وەبیر بێنمەوە ))ویەکسەر پێم گوت بەسەو تاقەتم نییە. هەمدیس دەیویست باسی خوام لەگەڵدا بکات. لێ من بەرەو ئەو چووم و بۆ دواجار بۆم روونکردەوە کە کاتێکی کەمم ماوەو نامەوێ بە خواوە لە دەستی بدەم. هەوڵیدا باسەکە بگۆڕێ. ولێی پرسیم بۆچی بە(( ئاغا ))ی بانگ دەکەم و پێی نالێم(( بابا ))ئەمە تووڕەی کردم و وەڵامم دایەوە کە بابی من نییە چونکە لەگەڵ ئەوان دایە.**

**دەستی خستە سەرشانم و گووتی: (( نە کوڕی خۆم ، من لەگەڵ تۆدام. بەلام تۆ ناتوانی لەمە بگەی . چونکە تۆ دڵێکی نابینات هەیە. من لە پێناوی تۆدا نوێژ دەکەم. دوعات بۆ دەکەم. ))**

هەنگیَ نازانم بۆچی شتێك لە ناخما تەقییەوەو بە هەموو هێزمەوە هاوارم کردو جنێوم دایی و پێم گووت کە چیتر نوێژ لە پێناوی مندا نەکات. یەخەی جبەکەیم گرت و هەرچیم لە دڵدا بوو بە هەڵچوونێکی ئاوێتە لە شادی و تورەیی بەسەرما ڕشت. زۆر ئاسودەو دڵنیا دیار بوو، وانا؟ لە گەڵ ئەمەشا، هیچ یەکێك لە یەقینیات و دڵنیاییەکانی هەودایەکی قژی ئافرەتێکی نەدەهێنا. ئەو تەنانەت دڵنیا نەوو لەمەی کە زندووە. چونکە وەکو مردوویەك دەژیا. ڕاستە کە من هیچم پێ نەبوو، هیچم لەدەستا نەبوو، بەلاَم بەلای کەمەوە لە خۆم دڵنیابووم. لە هەموو شتێك دڵنیا بووم، زۆر لەو دڵنیاتربووم. دڵنیابووم لە ژیانم و لەم مەرگەی کە بەرێوە بوو. بەڵیَ من جگە لەمە چ شتێکی دیکەم نەبوو. بەلای کەمەوە ئەم حەقیقەتەم لەخۆ گرتبوو، وەکو چۆن حەقیقەتەکەش منی لەخۆ گرتبوو. من لەسەر هەق بووم، هێشتاش لەسەر هەقم، هەمیشەش لەسەر هەق بووم. من بەو جۆرە ژیابووم و دەمتوانی بە جۆرێکی دیکەش بژیم. ئەمەم کردبوو و ئەوەم نەکردبوو. ))ئەو کارەم کردبوو کەواتە نەمدەتوانی ئەم کارە بکەم. پاشان؟ وەك بڵێی بەدرێژایی هەموو کاتەکە چاوەڕوانی ئەم چرکەیە، و ئەم سپێدە کورتە بووم تا پاك ببمەوە. هیچ شتێك، هیچ شتێك کەمترین بایەخی نەبوو و من چاك دەمزانی بۆچی. ئەویش دەیزانی بۆ- لە قولایی ئایندەمەوە، لەسەرانسەی ئەم ژیانە پوچەوە کە گوزەراندبووم، شنەوهەناسەیەکی ئاڵۆزو تاریك بەنێو ئەو ساڵانەدا کە هێشتا نەهاتبوون بەرەو رووم دەهات، ئەم شنەیە لەسەر ڕێگەی خۆیەوە هەموو شتێکی یەکسان دەکرد. هەموو ئەو شتانەی کە ساڵانی نەزۆر واقیعیتر لەو ساڵانەی کە گوزەراندمن، بەمنی دەبەخشی. مەرگی کەسانی دی یا میهرو سۆزی دایکێك، یا خوای ئەو بە من چی، بۆ من دەیکردە چی؟ یان شێوەی ئەو ژیانەی کە خەڵکی هەڵیدەبژێرن، ئەو چارەنووسەی کە هەڵیدەبژێرن بە من چی؟ بۆ من دەکاتە چی؟ مادامێکی یەك چارەنووس من هەڵبژێریَ، من و ملیاردان بنیادەمی بەختەوەری خاوەن ئیمتیاز هەڵبژێریَ کە وەکوئەم کەشیشە خۆی بە برای من دەزانی. ئایا نەیدەزانی. ئایا تیَ نەدەگەیی؟ هەموو خەڵکی هەر خاوەن ئیمتیاز بوون. هەموو تیرەی بەشەر بەشێوەیەکی یەکسان مەحکومن بەوەی کە رۆژیَ لەرۆژان بمرن. رۆژێك نۆرەی ئەویش دیَ. چی تێدایە ئەگەر ئەو پاش تۆمەتبارکردن بە کوشتن، لەسەر ئەمەی کە لە رێو رەسمی ناشتنی دایکیا نەگریاووە ئیعدام بکەن؟ سەگەکەی سالامانۆی پیر لە نرخی ژنیا بوو. ئەو ژنە زیتەڵەش رێك بەئەندازەی ئەو ژنە پاریسییەی کە ماسۆن خواستبووی کەمتەرخەم و تاوانبار بوو، یا بە ئەندازەی ماری کە حەزی لێبوو شوو بەمن بکات. چ قەیدییە کە ریمۆن-ش وەکو سیلست، کە بایەخی لەو زیاتربوو، ببیَ بە هاورێم؟ چی تیابوو کە ماری ئەمرۆ لێوەکانی بە مەرسۆیەکی تازە بسپێریَ؟ خودی کەشیشەکە وەکو کەسێکی مەحکوم نەیدەتوانی لەو شنە ئاڵۆزە، لەو سرتەیە تێبگات کە لە ئایندەی منەوە دەهات...

خەریك بوو بەدەم ئەم هەموو هات و هاوارو فریادەوە خەفە دەبووم، بەلاَم تازە کەشیشەکەیان لە چنگم دەرباز کردبوو. پۆلیسەکان هەڕەشەیان لێدەکردم. لەگەڵ ئەمەشا، کەشیشەکە هێوری کردنەوەو بۆ دەمێك بە بێدەنگی نیگای کردم و چاوەکانی تەژی رونداك بوو. رووی وەرگێڕاو لە چاو ون بوو. ئەو رۆیی من هێور بوومەوە. لە دەست و پیَ کەوتبووم و خۆم دا بەسەر تەختەکەدا. پێم وایە نووستم. چونکە گاڤیَ بێداربوومەوە ئەستێران بە دیارمەوە دەجریوانەوە. هەراو زەنای گوند دەگەییە من، بۆنی شەو و بۆنی خاك و خویَ، لاجانگەکانی فێنك دەکردمەوە. ئارامی سەیری ئەم هاوینە خەواڵووە، وەکو هەڵکشانی دەریا دەهاتە ناومەوە. رێك لەم دەمەدا، ولە ئاخرو ئۆخری شەوا گوێم لە شووتی کەشتیان بوو. ئەم شووتانە

سەرەتای سەفەریان بۆ دنیایەك رادەگەیاند كە لە ئێستاوە تا هەمیشە بەلای منەوە یەكسان و بێ بایەخ بوو. بۆ یەكەمین جار پاش ماوەیەكی درێژ بیرم لە دایكم كردەوە. وام بە خەیاڵدا هات كە دەمزانی بۆچی لە كۆتایی ژیانیا تازەتازە (( دەنكی )) گرتبوو، بۆچی لە نوێ گەمەی ژیانی دەست پێكردبووەوە. لەوێ ،لەوێش، لەدەورو بەری ئەو كەترەخانەیەی كە ژیان تیایا دەكوژایەوە، شەو وەكو هەڵوەستەیەك، وەكو هودنەیەكی خەمناك بوو. دیارە دایكم كە ئەوەندە لە مەرگ نزیك بووەتەوە دەبێ هەستی بەوە كردبێ كە ئازاد بووەو ئامادەبووە لە نوێ دەست بەژیان كاتەوە. هیچ كەس، هیچ كەس هەقی ئەوەی نەبوو بۆی بگری. و منیش هەستم دەكرد ئامادەم كە لەوێ دەست بەژیان بكەمەوە. وەك بڵێی كە ئەم خرۆشی تورەییە بێ سنورە منی لە بەدی و خراپی پاك كردبێتەوە، لە هێڤی و ئومێدی خاڵی كرد بمەوە. بۆ یەكەمین جار لە بەردەم ئەم شەوە پڕ لە نیشانان و ستێرانەدا خۆم بە دەستی بێ موبالاتی و بێ میهری دنیا سپارد. كە زانیم دنیا بەم ڕادەیە لە من دەچێت و ئەوەندە برایانەیە، هەستم كرد كە بەختەوەر بوومەو هێشتاش هەر بەختەوەرم. جا بۆ ئەوەی هەموو شتێك بگاتە كەماڵی خۆی، وبۆ ئەوەی كەمتر هەست بە تەنیایی خۆم بكەم، تەنیا ئەمەم بۆ مابووەوە كە خۆزی بخوازم كە لەرۆژی ئیعدامكردنەكەمدا، تەمەشاڤانانێكی فرە ئامادە بن و بە هاواری پڕ لە كینەی خۆیان پێشوازیم بكەن.

---

**سەرچاوە:**

**البر كامو**

**بیگانە**

**جلال ال احمد_ علی اصغر خبرەزادە**

**موسسە انتشارات نگاە**

---

**تهران- ١٣٨٥**